فریدون مُشیری



# تۆ لێرەنی تا ببینی

وەرگێڕانی : د. ناصح قەرەداخی

# تۆ لێرەنی تاببینی

هەڵبژاردەی هۆنراوەکانی

**فەرەیدون موشیری**

وەرگێڕانی

**د. ناصح قەرەداخی**

٢٠٠٧

# ناوەرۆک

# پێشەکی

فەرەیدونی موشیری بەدرێژایی نزیکەی نیو سەدە ئەزموونی شیعری، بێ کۆڵدان و ماندووبوون ، گۆرانی بە خۆشەویستی و میهرەبانی و مرۆڤدۆستیدا وتووە. بە دڵێکی بریندار و پڕ حەسرەتەوە، بەڵام ئومێدەوار و باوەڕدار بە سروشتی پاکی بەشەر، مرۆڤی بانگهێشت کردووە بۆ بەهەشتی خۆشەویستی و پاکی و برایی.

موشیری لە گێروداوی سەرهەڵدانی شیعری نوێی فارسیدا دەستی پێ کردووە، بەڵام نە بەتەواوی پشتی کردۆتە ئەدەبیاتی کلاسیکی و نە هەوڵی نوێخوازیشی رەت کردۆتەوە. ئەو رێگەی ناوەراستی گرتۆتەبەر و خۆی نەبەستۆتەوە بە قاڵبەکانی عەرووزەوەو بە شێوەیەکی لێزانانە کەڵکی لە کورت و درێژکرنەوەی بەیتەکان وەرگرتووە و بە پێی پێویستیش سەروای بەکارهێناوە. لەم قاڵبە تازەیەدا بە سەربەستییەکی زیاترەوە هەست و سۆزی خۆی بەرامبەر سروشت و جوانی و خۆشەویستی و ژانەکانی مرۆڤ دەربڕیوە.

هەڵبژاردنی چەپکیك لەگوڵزاری بەرین و دلگیر کارێکی دژوارە و هەمیشە مرۆڤ دەخاتە دوودڵییەوە. ئەڵبەتە من ئەم هۆنراوانەم لە ئەسڵێ دیوانەکان گوڵبژێر نەکردووە، بەڵکو پشتم بەسێ کتێب لە هەڵبژاردەی دیوانەکانی شاعیر بەستووە( جوانی هەمیشەیی، یەك ئاسمان پەلەوەر، فڕین لەگەڵ خۆردا) و ئەمەش تاڕادەیەك کارەکەی بۆ ئاسان کردووم. هەرچەندە هەوڵم داوە لەهەموو دیوانەکان و لەهەموو فۆرم و بابەتەکان هۆنراوە هەڵبژێرم بەڵام لەو باوەڕەدام هەر نەمتوانییێ بەیەکجاری خۆم لە مەحەکی حەزو سەلیقەی خۆم رزگار بکەم. بەهەرحاڵ ئەمانە رەنگە کۆمەڵێك بن لە

بەناوبانگترین و خۆشترین هۆنراوەکانی شاعیر بەڵام بێگومان هەموویان نین. هەندێ لەم هۆنراوانە پێشتر لە بڵاوکراوە کوردییەکاندا بە چاپ گەیشتوون.

لە وەرگێراندا، هەوڵم داوە ئەوەندەی تەرجەمە رێگا بدا و سەلیقە توانای بەسەریدا بشکێ، لەگەڵ پاراستنی گیانی هۆنراوەکاندا، فۆرم و مۆسیقاشیان بپارێزم بۆئەوەی خوێنەر هەست بکات شیعری فەرەیدونی موشیری دەخوێنێتەوە نەك پەخشانێك بە ناوەرۆکی هۆنراوەکانی ئەو. ئەمە بێگومان کار و حەوسەڵەیەکی زیاتری ویستووە کە لەلایەکەوە بەهیوای بەدەست هێنانی رەزامەندیی خوێنەر و لەلایەکی تریشەوە لەبەر ئەوەی لەوباوەرەدام ئەوە باشترین شێوەی پاراستنی ئەمانەتە لە گۆڕینی شیعردا لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر، ئەو زەحمەتە زیادەیەم لەم چەپکە هۆنراوەیەدا بەگەڕ خستووە. هیوادارم ئەم بەرهەمە کەلێنێك پڕ بکاتەوە لەناساندنی ئەدەبیاتی هاوچەرخی ئێران بە کۆمەڵێکی فراوانتر لە خوێنەرانی کورد.

د. ناصح قەرەداخی

هەولێر، ٢٠٠٤

nasihqeredaxi@yahoo.com

# ژیاننامەی فەرەیدون موشیری بە پێنووسی خۆی

لە خەرمانانی ساڵی ١٣٠٥ ی هەتاویدا (١٩٢٦ی زایینی) لە تاران، شەقامی عین الدوله(ئێرانی ئێستا) هاتوومەتە دنیاوە و تا حەوت ساڵی لە تاران بووین . باوکم کە لەوەزارەتی پۆست و تەلەفوون و تەلەگراف کاری دەکرد، رەوانەی مەشهەد کرا و ئێمەش بۆماوەی حەوت ساڵ لە مەشهەد ماینەوە تا ساڵی ١٣٢٠ کاتێ ئێران دووچاری ئاژاوە بوو (جەنگی دووەم و داگیرکردنی ئێران لەلایەن هاوپەیمانانەوە و رووخانی رەزاشا) ئێمەش گەراینەوە بۆ تاران.

باوکم، ئیبراهیم موشیری ئەفشار، لە خێڵی ئەفشار بووەوە کە باوباپیرانی بەجۆرێك دەگەنەوە سەر نادرشای ئەفشار. وەك دەڵێن یەکێ لە باپیرانی باوکم شمشێربازی نادرشا بووە و پاشاش لەبەرامبەر خزمەتەکانیدا هەندێ زەوی پێ بەخشیوە لە دۆڵی مواردبێگ لە هەمەدان تا لەوێ نیشتەجێ بێ. باوکم لە هەمەدان لەدایك بووە و لە بیست ساڵیدا هاتۆتە تاران. نزیکەی چل ساڵ لە وەزارەتی پۆست و تەلەگراف و تەلەفوون خزمەتی کردووە تا لە ساڵی ١٣٦٠ دا کۆچی دوایی کرد.

دایکم نەوەی امیر الامراء بووە لە خێڵی ظهیرالدولةی کرمانی. ناوی خورشید بووە و نازناوی اعظم السلطنة بووە. باوکی دایکم، میرزا جوادخان موتمن الممالك بەناوی "نجم" ـەوە شیعری وتووە. کۆمەڵە هۆنراوەکانی لەبەردەستایە کە بەداخەوە هێشتا هەلی چاپکردنی نەرەخساوە و پێویستی بە

کەسێکە پارەی تێدا بخاتە گەڕ. بەهەر حاڵ ئەمانە سەر بە سەردەمی قاجار بوون و پەروەردەی کلتووری قاجاری.

دایکم لەتەمەنی ٣٩ ساڵیدا بەهۆی نەخۆشی دڵ گیانی لەدەست داوە. من ئەوکاتە تەمەنم ١٩ ساڵ بوو و مردنی گاریگەرییەکی گەورەی لەسەر خۆم و هۆنراوەکانم بەجێ هێشت. ئێمە سێ برابووین و من ناونجییانم. مەنسوور براگەورەمان بوو کە پار کۆچی کرد، برابچووکەکەشم ناوی مەنوچەهرە. خوشکێکیشمان هەیە کە دایکی جیایە.

خوێندنی سەرەتاییم لەتاران دەستی پێ کرد تا پۆلی دووەم. پاشان تا پۆلی هەشتەمم لەمەشهەد خوێند. سەرەتا ئەچوومە قوتابخانەی سەرەتایی "هیممەت" و ئینجا چوومە دواناوەندی "شاهڕەزا" کە بەرێوەبەرەکەی مامۆستای ئەدەبیاتی خۆراسان، علی اکبر شەهابی بوو کە چەند ساڵێك لەمەوپێش کۆچی دوایی کرد. کە هاتینەوە تاران یەك دوو ساڵ لە دار الفنون دەرسم خوێند و ئینجا چوومە دواناوەندی ئەدیب. پاش ئەوە بەهۆی گیروگرفتی خێزانییەوە چوومە خوێندنگای هونەریی وەزارەتی پۆست و تەلەگراف و تەلەفوون و ناچاربووم لەپاڵ خوێندندا کار بکەم تا ئەوەبوو لەساڵی ١٣٢٤دا لەهەمان وەزارەت دامەزرام.

بەمجۆرە هەمان ئیشەکەی باوك و باپیرەم گرتەدەست. باپیرەم لەبەرئەوەی لە سەردەمی قاجاردا بۆ دامەزراندنی هێڵی گەیاندن لە هەمەدان و کوردستان وکرماشان زەحمەتی زۆری کێشابوو، ناصرالدین شا نازناوی "موشیر"ی پێ دابوو بەمانای راوێژکار و ئێمەش هەمان نازناومان بۆ مایەوە.

منیش وەك هەموو گەنجانی شازدە حەڤدە ساڵەی هاوتەمەنم سەرەتا بە بابەتی خۆشەویستی خووم دایە هۆنراوە و هۆنراوە وتن. ئەوکاتە پەی بردن بە بابەتە کۆمەڵایەتییەکان لە توانای ئێمەدا نەبوو. بۆنموونە یەکەم کتێبم هەمووی هۆنراوی عاشقانەیە. ئەڵبەتە هەموومان بە خۆشەویستی دەست پێ

دەکەین، سەعدی وتەنی "بیرمە سەردەمی لاوی، وەك رووئەداو ئەزانی، ..."
منیش بە عیشق دەستم پێ کرد و پاشتر گەیشتم بە لقەکانی تری ژیان. ..

یەکەم هۆناوەم بیرمە ناوی " سبەینێی ئێمە" بوو. ئەو کاتە خوالێخۆشبوو جهانیگیر تفضلي رۆژنامەیەکی هەبوو بەناوی "ایران ما" کە بێجگە لەچەند وتارێکی سیاسی لە لاپەرەی یەکەمدا زۆربەی هەشت لاپەرەی ئەم رۆژنامەیە بابەتی ئەدەبی بوو بەتایبەتی تەرجەمەی نووسەرانی فەرەنسایی وەك ڤیکتۆر هۆگۆ و لامارتین و ئەندرێ مۆروا و ئەوانی تر. بەراستیش ئەمە خزمەتێك بوو بەم وڵاتە کە بەداخەوە لەبیرکراوە. لەپاش مەشروتیەت، دەرگای ئەدەبیاتی رۆژاوا بەرووی ئێران کرایەوە و بەرهەمی نووسەرانێك کە پێشتر نەمان دەناسین تەرجەمە و بڵاوکرایەوە. بۆنموونە گۆڤاری "بهار " و "دانشکدە" و ئەوانی تر بەرهەمی نووسەرانی رۆژاوایان تەرجەمە و چاپ دەکرد و نەوەی ئێمە بۆی دەرکەوت کەوا لەوبەری دنیاش خەبەرێك هەیەو ئەدەبیات تەنیا بریتی نیە لە " فرائد الادب " و کتێبەکۆنەکانی تر.

من هەموو هەفتەیەك "ایران ما" م دەکڕی و دەمخوێندەوە. ئەو سەردەمە هۆنراوەکانی دکتۆر محمد حسین شهریار( چونکە ساڵی کۆتایی پزیشکی بوو بە دکتۆر ناویان دەهێنا– ئەڵبەتە دوایی وازی لە پزیشکی هێناو تەنیا خووی دایە هۆنراوە) چاپ دەکراو بە " شاعیری میللەت" ناودەبرا. هۆنراوەی فەریدوون تەوەللی بەردەوام چاپ دەکرا. هەروەها هۆنراوەی مهدی حمیدی شیرازی و ابوالحسن وەرزی و دواتر نادر نادرپور. بەکورتی کۆمەڵێك شاعیر هەبوون کە هۆنراوەیان لە لاپەرە ئەدەبییەکانی "ایران ما" چاپ دەکرا. منیش زۆر حەزم دەکرد خۆم تاقی بکەمەوە. هۆنراوەی " سبەینێی ئێمە" م نارد بۆ ئەو هەفتەنامەیە و بە چاپێکی باش و پیتی تارادەیەك گەورە و شێوەیەکی جوان بڵاویان کردەوە. هەفتەی دواتریش لە ستوونی خوێنەراندا

بۆیان نووسیبووم " بەرێز فەرەیدون مشیری ئەو هۆنراوەیەی کە ناردبووت لە ژمارەی پێشوودا چاپ کرا. کۆبوونەوەی دەستەی نووسەرانی "ایران ما" زۆر بەلایانەوە پەسەند بوو، خۆشحاڵ ئەبین ئەگەر هۆنراوەی ترت بلاوبکەینەوە."

منی قوتابی ئیتر چاوم ئەرزی نەدەبینی. ناهەقم نەبوو لەسەرەتای کاری شاعیریما ئەو هەنگاوە سەرەتایەکی باش بوو. من هەر لە ١٥ ساڵیەوە کەوتمە ناو چاپەمەنییەوە. پەیامنێریم دەکرد و جارجار شتێکم دەنووسی . زۆر حەزم لە نووسین بوو. کە چووشمە زانکۆ پاش دوو ساڵ خوێندنی ئەدەبیات کۆلێژەکەم گۆری بۆ رۆژنامەنووسی چونکە زیاتر حەزم لە رۆژنامەنووسی بوو. بەڵام شیعریش بەردەوام لە وجوودمدا چەکەرەی دەکرد و هەستم دەکرد زۆر بەتینەو گەرمە و سوپاس بۆ خودا هێشتاش سەرچاوەکەی وشکی نەکردووە.

ساڵی ١٣٣٤کە تەمەنم ٢٩ ساڵ بوو یەکەم کۆمەڵە هۆنراوەم چاپ کرد بەناوی "تینووی تۆفان". خوالێخۆشبوو شەهریار کە لەتەبرێز دەژیا و من تا ئەو کاتە نەمدیبوو، نامەیەکی بۆ نووسیم و بە " شاعیری پایەبەرز" ناوی بردبووم. ئەڵبەتە ئەمە بۆ من کە ئەوکاتە گەنج بووم زۆر مایەی شانازی بوو.

ئەو کاتە گۆڤارێك بە ناوی "خروس جنگی" چاپ ئەکرا. جارێکیان هۆنراوەیەکی بێ مانای تێدا چاپ کرابوو کە گوایە شیعری نوێیە. خوالێخۆشبوو علی دەشتی لە گۆڤاری "کاویان" دا وتارێکی باشی لەسەر ئەوە نووسیبوو کە ئەم جۆرە قسە بێ سەرو بنانە کەی شیعرن. دواتر حەزی دەکرد ئەم وتارەی وەکوو پێشەکی لە دیوانەکەی مندا بلاوبکاتەوە. بەرێز دەشتی بۆیان نووسیبووم" بەرێز! هۆنراوەکانی تۆم خوێندەوە و ئەو هیوایە لای من تینی تێ هات کە شیعری نوێ خەریکە ئەچێتە قۆناغێکی جیددی و سەرەکییەوە.."

دواتر لە گۆڤارەکانا لاپەری ئەدەبی و هۆنراوەم بەرێوە دەبرد. حەڤدە هەژدە ساڵ لە گۆڤاری "روشنفکر" دا ئیشم کرد. هەروەها لە "سپید و سیاە"

و یەك دوو ساڵیش لە "تماشا" کە پێش شۆرش بڵاوکراوەیەکی هەفتانەی رادیۆ و تەلەفزیۆن بوو. جگە لەوەش لە گۆڤاری " زن روز" ی دەزگای بڵاوکردنەوەی رۆژنامەی کەیهان و چەند مانگێکیش لە گۆڤاری " تهران مصور" کارم کردووە. بەڵام ئەو لاپەرانەی لە " روشنفکر" هەمبوو زۆر گرنگ بوون. وەك هاورێیەك دەیوت هەرکەس هۆنراوەیەکی لەو گۆڤارەدا چاپ بکردایە ئیتر وای دەزانی بووە بە شاعیر. بیرمە شەهریار لە تەبرێزەو هۆنراوەی دەنارد و بە خەتی خۆی لە سەری دەنووسی " بۆ هاورێی خۆشەویستم فەرەیدون موشیری بەمەبەستی بڵاوکردنەوە لە گۆڤاری روشنفکردا."ئەو ماوەیەی کە رۆژنامەنووسیم دەکرد لەگەل زۆر لە کەڵەپیاوانی ئەدەبیاتدا چاوپێکەوتنم کرد وەك دهخدا و و دوکتور معین و پورداود و... ئەم چاوپێکەوتنانە زیاتر لە و لاپەرانەی روشنفکردا بڵاودەکرانەوە کە خۆم بەرێوەم دەبردن. . لەم لاپەرانەدا بێجگە لە شعر زۆر بابەتی تریش بڵاودەکرایەوە دەربارەی ئەدبیات و مۆسیقاو ئۆپێرا و کتێب و رەخنەی ئەدەبی و سینەما و بەکورتی دەربارەی هەموو بابەتێکی ئەدەبی دەنووسرا. من هەوڵێکی زۆرم ئەداو ئەو دوو لاپەرەیەش زۆر پەسەندی خوێنەران بوون.

لەگەڵ نیما کە بە باوکی شیعری نوێ دەناسرا، چاوپێکەوتنم کرد. چەند جارێك چوومە ماڵی کە دەکەوتە کۆتایی جادەی کۆنی شەمێرانەوە لە کۆڵانی فیردەوسی. ئەو ساڵانەی سەرەتای خزمەتی ئیداریم تەلەگرافچی بووم و لەسەر دەزگای مۆرس ئیشم دەکرد چونکە هێشتا تەلەتایپ پەیدا نەبووبوو. شوێنی ئیشیشم لەسەر پردی تەجریش بوو. عەسران کاتێ نیما خەم دای دەگرت و بە پیاسە لەماڵ دەهاتە دەر سەری لێ ئەدام و لام دادەنیشت و منیش چاییم بۆ دەهێناو پێکەوە قسەمان دەکرد.

جگە لە گفتوگۆ لەگەڵ نیما، زۆر بابەتم دەربارەی شیعرەکانی لە رۆژنامەکانی ئەو کاتەدا بڵاوکردۆتەوە. بیرمە نیما زۆرجار حیکایەتێکی جوانی

بۆ دەگێرامەوە کە رەنگە هێنانەوەی لێرەدا بۆ ئەو کەسانەی کە لایان وایە شیعری نوێ دەنووسن بەلاّم لەراستیدا ئەوەی دەینووسن بێ کێش و سەرواو تەنانەت بێماناشە، بەسوود بێ. ئەیوت جادوگەرێك هەبووە لە ولاّتی چین باغێکی گەورەی هەبووە. هەر کاتێ ویستوویەتی باران بباریّ ویردێکی خوێندووە و باران باریوە. کاتێ گولّ ودرەختەکانی باغەکە تێراو بوون ویردێکی تری خوێندووە و باران خۆشی کردووە . جارێکیان دەیەوێ بچێتە سەفەر و لای وایە سەفەرەکەی سێ رۆژ زیاتر درێژەناکێشێ بۆیە بە شاگردەکەی نەوتووە دەربارەی ئاودانی باغەکە چی بکات و چی نەکات. شاگردەکە زۆر جار ئاگای لە ئوستادی بووە کە ویردی باران بارینی خوێندووە بۆیە فێربووبوو چۆن باران ببارێنێ بەلاّم نەیدەزانی چۆن بارانەکە راوەستێنێ. باران هەر ئەباریّ و ئەباریّ تا گولّ و چیمەن و دەرخت و هەرچی باغەکەیە ئاو دەبیات و وێران دەبێ.

نیما ئەیوت من ئەو جادوگەرەم کە ئەم جەماعەتە( گۆڤارێکی نیشان دەدا کە شیعرێکی تێدا بوو بەم سێ دێڕە)

من

و

تۆ

تەنیا ویردی باران بارین لەمن فێر بوون بەلاّم ویردی باران خۆشکردن فێرنەبوون بۆیە ئەم جۆرە شتە بێ سەروبەرانە دەنووسن.

باوەربکەن ئەم پیرەمێردە تا کۆتایی ساڵەکانی تەمەنی بە تەوازوعەوە دەیوت" من هێشتا رەشنووسی دەکەم. جارەها وجارەها دەگەرێمەوە سەر شیعرەکانم و سەیریان دەکەم و چاکیان دەکەم. تازە هەست دەکەم ئەم شیعرانەم حالّ و هەوای خۆیان بەدەست هێناوە."

نیما زۆر بیری لە شیعرەکانی دەکردەوەو وەسواس بوو. ئەیویست شیعرەکانی تەواو و جوان و و بیٚ کەموکوڕی بن. بەڵام خەڵکی ئەمەیان نەدەبینی و لایان وابوو نیما لەخۆیەوە شت دەڵیٚ و نیوەدێرەکان کورت و درێژدەکاتەوە. پەییان بەوە نەدەبرد کە نیما چ دیققەتێك لەژیان و دەروبەری خۆی دەکات، چۆن شیعری لە دەربارەوە هێناوەتە ناو خەڵکی . شیعری کۆنی ئێمە شیعری دەرباری بوو و لە سەردەمی نیما بەدواوە شیعر بەراستی بوو بەهی خەڵکی. نیما زۆر هەوڵی ئەدا لە شیعرەکانیدا خۆی لە مۆسیقای قورس دوور خاتەوە. ئەو دەیوت شیعر دەبیٚ بە زمانی قسە، بەزمانی خەڵکی نزیك بیٚ. نیما لە شیعرەکانیدا ئەڵێی لەگەڵت قسە دەکات. ئەڵبەتە ئێرە جێگەی ئەم باسە وردو ئاوکێشانە نیە.

بێینەوە لای خۆمان. من دوو شت لە نیما فێر بووم بەڵام رێگەی خۆمم گرتەبەر. بەهۆی ئەو پەیوەندییە گەرمەی بە شیعری کۆنەوە هەمبووە و هەمە، بەلای منەوە تا ئەوکاتەی ئێمە حافز و سەعدی و فیردەوسی و کەڵە مێردانی تری شیعری فارسی ستایش بکەین و بپەرستین، ناتوانین کوتوپڕ ئەم رابوردووە بقرتێنین و بیخەینە لاوە. من لە نیما فێربووم چۆن سەیری ژیان و سروشت بکەم. ئەمە گرنگترین شتە. دووەم ئەوەبوو لە نیما فێربووم کە لەجیاتی ئەوەی وەك فیردەوسی و مەولەوی چەند هەزاربەیتیك بە کێش و سەروای یەکڕەنگ بڵێم، یا غەزەل بەهەمان کێش و سەروای تیکراری، ئەتوانم ئەو قاڵبانەی نیما پێشنیاری کردبوو بەکاربێنم یانی بە بەیتی کورت و درێژ. .. لەهەر شوێنیٚ قسەم تەواو بوو هەر لەوێدا تەوای بکەم و خۆم لەقاڵبێکی دیاریکراودا زیندانی نەکەم. ئەم دوو وانە گرنکەی لە نیما فێر بووم توانای ئەوەیان بەمن دا شیعر بلێیم بە جۆرێك هەندیٚ شیعرم وەك " جادووی بیٚ تەئسیر" (شیعری پڕیکە پێك، کە ئەم ئاوە ئاگرینە...) لەگەڵ ئەوەشدا کە شیعری نوێیە بە قاڵبی نیمایی لە بەیتی کورت و درێژدا، چووە ناو گۆرانیی

ئێرانییەوە و فەردەیدون شەهبازیان ئاوازی بۆداناو شەجەریانیش زۆر جوان چڕی. وەك دەزانی گەورەپیاوانی گۆرانی ئێمە تەنیا شیعری کۆنیان چڕیوە– غەزەلەکانی حافز و سەعدی و فروغی و ئەوانی تر. بەڵام شیعری نوێ بەم جۆرە داخڵی مۆسیقای ئێرانی بوو و بەردەوامیشی هەبوو چونکە زمان هەمان زمان بوو و بیستەر پێی بێگانە نەبوو.

لەسەرەتای کارمدا، هەر ئەوکاتانەی کە ناچاربووم ئیش بکەم، سێ چوار گۆرانیم دانا کە رەشیدی و یاسەمین چڕییان بەڵام بەداخەوە قەوان وشریتەکانیانم نەماوە. ئەو کاتانە جارجار لە رادیۆی ئێرانەوە داهاتنەلام بەڵام من لەسەر دانانی گۆرانی بەردەوام نەبووم. دواتر هەندێ لە شیعرەکانی من ئاوازی بۆدانرا. جگەلەوەش چەند کارێکی هاوبەشیشم لەگەڵ ئەهلی مۆسیقادا کردووە کە هەردوو سەرکەوتوو بووین.

تا ئێستا دیوانەکانم بەردەوام چاپ کراون و هەندێکیان چەندین جار چاپ کراونەتەوە. لەو کتێبانەی کە چاپ کراون ئەتوانم ئەمانە بلێم: "گوناهی دەریا" (١٣٣٥)، "بەدەست نەهاتوو"(١٣٣٦)، "هەور"(١٣٤٠)، "هەورو کۆڵان"(١٣٤٦)،"باوەر بە بەهار بکە"(١٣٤٠). لە ساڵی ١٣٤٨ دا هەڵبژاردەی ئەم کتێبانە بە ناوی "فڕین لەگەڵ خۆردا" بڵاوکرایەوە.

کتێبێکم هەیە بەناوی "روانین بۆ یەك لا، روانین بەیەکسانی" کە لەراستیدا کورتەی "اسرار التوحید فی مقامات ابو السعید ابی الخیر" ـە. ئەم کتێبە چەند حیکایەتێکی کورتی زۆر جوانی تێدایە کە جیام کردوونەتەوە و ئەو بەشانەم لێ لابردوون کە عەرەبین یا خوێنەر تاقەتی لێیان نیە لەبەر قورسی. کتێبێکی خۆشە، سەد بەسەرهات لە ابوالسعید ابی الخیرەوە.

لەپاش دەیەی شەستەوە هەڵبژاردەی شیعرەکان و کتێبی تریشم چاپ کران. لەوانە "ئاه، باران"، "مرواریی خۆشەویستی"، " لە هەواری ئاشتییەوە"، "لە بێدەنگییەوە". ئەمەی دوایی بڕیار بوو کتێبێکی گەورەتر بێ

بەناوی " لەبێدەنگییەوە تا هاوار" کە هاوارەکەی نەهات و تەنیا بێدەنگییەکەی چاپ کرا. دوای ئەمانە " ئاوازی ئەو مەلە خەمبارە"، "دڵگیرترین" ، "یەك ئاسمان پەلەوەر"و "جوانی هەمیشەیی" کە دەزگای پەخشی عیلمی بە شێوەیەکی جوان چاپی کردووە. بەگشتی لەگەڵ نامیلکەی " لەگەڵ پێنج شاعیردا" و هەڵبژاردەکاندا هەمووی خۆی دەدات لە بیست کتێب.

ئەم بابەتە لە رۆژنامەی "همشهری" رۆژی ۲۰۰۰/۱۰/۲۹ دا بەبۆنەی کۆچی دوایی شاعیرەوە بڵاو کراوەتەوە و ئێمەش لەوێوە تەرجەمەمان کردووە. فەرەیدونی موشیری رۆژی ۲۰۰۰/۱۰/۲٤ لە تەمەنی ۷٤ ساڵیدا بەهۆی شێرپەنجەی خوێنەوە (لوکیمیا) لەتاران کۆچی دوایی کردو هەر لەوێش بەخاك سپێردرا.

## خەزان لە بەهەشت

بەهار باخی خەزاندیوی جوان کردووە

لە ئەوینی بە خەزان گەشتووم چی بکا، گوڵ

سەری دەرهێنا وەنەوشە، ئەی خودایە

سەر لەیەخەی ماتەمایە، هێشتاکە دڵ

***

بەم بەهارە چۆن نەگریم وەک هەوری بەهار

کە نەمچنی گوڵێ لە بەهاری لاوی

دڵت وەختێ بەحری سەفاو جلوەی عیشق بوو

جەفای ئەهلی سەفا مابوو، ئەویشم دی

***

بەهیوای ژوان، زەحمەتی عیشق خۆشیی دڵ بوو

گشت هیواکان بەباچوون و بوون بە بەلا

مەڵێ خەزان پەی بە باخی بەهەشت نابا

شا! بەهەشتی عیشقم لەژێر پێی خەزانا!

***

پڕ چقڵت کرد چاوی ئومێدەواری من

ئەم بەهارە، نەک هەر دڵێ منت شکان،

بەهار کە وەرزی دڵداری و پەیمان دانە

بە دڵرەقی لەبەهارا دات لە پەیمان

*****

## کاروان

تەمەن پێ لە دڵم ئەنێ و تێئەپەڕێ
چاو ماندوو بوو لەسەیری پایز و بەهار
گەر نارِوانمە گوڵ و گوڵزار، سەیر نیە
لەو بەهارەی دڵ ناپشکوێ لەخەندەی یار

گوڵ لە مێرگا بە سیمای پەژموردەی من چی؟
بەدڵی غەمخواردووی من چی گوڵاڵەی باغ؟
من چیم هەیە تا بۆی بەرم بێجگە لە ئەشک
ئەو چیی هەیە بۆ دڵی من بێجگە لە داغ؟

تەمەن پێ لە دڵم ئەنێ و تێئەپەرێ
مژدەی ئازادی لەبۆ زیندانی ئەبا
خۆزگە زووتر ئەگەشتە مەنزڵی دڵخواز
ئەم شەوە تاریکە بەڵکوو شەبەق بدا

پەنجەی مردن یەخەی ئاواتی گرتووە
مۆمی گیانم هەر شەو لەپاڵیا سووتاوە
گیانی ئازار چەستووم هەڵدێ لە بۆی بەهار
بێ تۆ نەورۆزیشی درِکە و لەدڵ ماوە

تەمەن پێ لە دڵم ئەنێ و تێئەپەرێ
کاروانێکە هەموو سیحرو فێڵ و داوە
بردەی خەزانە سالأنێک، باخ و بەهارم
سینەم لە خەمی نامۆیی دڵ ئاوساوە

هەر تەماشای رووی گوڵ و مێرگ نیە، بەهار
بێ ڕووی دوڵبەر زۆر زۆر گوناهە بە یەزدان
بەهار ئەوەیە کە لەپڕ بەیەک ئەگەن،
دوو پێکەنین، دوو نیگا پاش لێکدابڕان

*****

## کیمیا

گوڵی ئەکڕی، ڕوومەت گولیٚ لە گولٚ فرۆش
ئەیوت:
-"مالٚ بەبیٚ پیٚکەنینی گولٚ بیٚ سەفایە!"
منیش وتم:
-"سەفای مالٚ تەنیا بەس نیە،
ئەبیٚ سەفای گیان پەیدا کەی کە کیمیایە!
ئەی ئەوکەسی لە گوڵزاری ژیانا، ڕووت
وەک گولاٚلە دلٚرفیٚن و بەسەفایە،
با گیانیشت هەر وەکوو ڕووت بەسەفابیٚ
تا ببینی کەماڵی تۆ ماڵی خوایە!"

*****

# هەواری لافاو بردوو

هەور، ئاوارەی حەیرانی زەمان

سێبەر بەسینگی زەمینا دێنێ

با، شێتی پێ بەزنجیری کوێستان

لەناکاو کۆتی پێ دەپسێنێ

هەورەگرمە، دیل، ساحیری فەلەک

جیهانی سەرەوە دەلەرزێنێ

بروسکەش مەشخەڵی گێچەڵ بەدەست

تاریکاییەک، گۆڕاو، ترسناک

خەپلەی هەتاوی لەگەروو ناوە

شەپۆلی هەورەو بارانی تەرزە

بەردیان رشتەناو پێکی سەفاوە

ئەمە نە بەلاو تەرزە و بارانە

مەرگە دەیرژێ فەلەک لەم ناوە

هاتۆتە لەرزە کێو لەدەست سروشت

هەروەکوو دێوێ گیرۆدەی داو بێ

یا دەعبایەکی لەکۆت راپسکاو

لافاو هاژەی کرد لە کێو هاتەخوار

لەگشت لا ئالای تەسلیم هەڵکراو

گابەردی هەڵکەند بەناڵەو هاوار
باخی داپاچی بە سینەی کوتراو
یەک شاڵو جەرگی خاکی هەڵدڕی

زولفی پەشێوی کۆنە درەختان
بەرەو خوا دەستی نزا ئەهێنێ
داسی بێرەحمیی لەدەستا، لافاو
هەمووی لە رەگوڕیشە دەردێنێ
تل ئەدەن لەناو تاوی لافاوا
گەرووی مەرگ، ڕێگەی بەڵا ئەنوێنێ
دۆزەخی ترس و دەریای ئازارە

شالاڤوی لافاو هەروەک تەڵەپووش
دایەبەر، کێوی بەرشەتاو کەوتوو
رووبار دەریایە و لەسەر شەپۆلی
وەکوو بڵق سوور ئەخوا دارو پەردوو
جەستەی تاریکتر لە قیری شلە
ئەژدیهایەکە دەمی کەف کردوو
لەو تاریی غەما خوێن دەخرۆشێ

بۆ رزگاریی گیان تەقەللایەتی،
یەکێک لەناو ئاو سەر دێنێتە دەر
ئەیەوێ هاوار بکا پڕ بەدەم

نالەی سەرد لەقوڕگی نایەتە دەر

شالاوی شەپۆل ئامانی نادا

گێژەن ئەمجارەش ئەیداتەوەبەر

لەدڵی ئاوا روخسار ون ئەبێ

کوشتارگایەکی چەند ترسناکە

لە سینگی لافاو خوێن جۆش ئەهێنێ

لافاو هاژەی دێ و بەدەم نالەوە

چەقۆی مەرگ بەمل خەڵکا ئەهینێ

ئەی لەو گشت سەرەی کەدای بەبەردا

لەو گشت جەستەیەی خاک دەیگەوزێنێ

هاوارو نالەی کەسی نەشنەفت

لەبەسەرهاتی هەورام چی بڵێم!

ئاسمان بانگی ستەمکاریی دا

یەک دنیا سەفا رژایە ناو خاک

یەک دنیا گوڵیش رۆیشت بەبادا

دەک کۆشکی زوڵمی فەلەک وێران بێ

مشتێ خۆڵ و پووش جێ ما لە جێدا

خەرمانی ژینی عەشرەتی سووتان

هۆ هۆ ئاسمان! بەخوا ئەبینم

پەڵەی نەنگ لەسەر ناوچەوانی تۆ

خەڵکی مەلوول و داماوی زەوی

هیواخوازن بۆ پەرێشانی تۆ

وای لەو رۆژەی کە بەیەکتر دەڵێن

بەسەرهاتی لێک هەڵوەشانی تۆ

خەڵکانت هەموو رووت و داماوکرد

دەشت و سەزایی قەشەنگ و دڵگیر

ئێستا غەمخانەی خەمداگرتووە

گولزاری هۆشی دڵشکاوی من

گەرچی وەک هەوار تۆفان بردووە

هێشتا لەداخی ئەوا ئەسووتێم

لەدەست تەبیعەت دڵم سووربووە

کوندەبووی وێرانەی هەوارم من

نیوەشەو لەسەر ئەو بانە بەرزە

مانگ بەسەر وێرانەدا ئەنوارێ

بەسەرقەبرانی عیشق و چوستییا

لە دیدەی مانگ ئەشکی خەم ئەبارێ

گشتی وێرانە، وێرانەیەک، شووم

ئەی مانگ لەپای چی ، ئاه، هەڵدێی جارێ؟

روخساری مردوو تەماشای ناوێ

لەیەکەم شیعرا بەتۆم وتبوو

کە تۆ بەهارو هەواری منی

تۆ سۆزت لەمن بڕی و دی نەما

نە بەهار، نەگوڵ نە یاسەمینی

لافاویش هات و رایماڵی هەوار

لەتاو خەم نەما شیعر خوێندنی

دی سەر کز ئەکەم خامۆش ئەمێنم

*****

# ئاوارە

نیوە شەو بوو خەمێکی تازە دەرکەوتوو
سەر ڕێی خەوی دڵی گرتم، کەوتم بێدار
لە رووناکی لەرزۆکی مۆمەوە رژا
سێبەری چەپکە گوڵێ و کەوتە سەر دیوار

هەمووی گوڵ بوو بەڵام گوڵێ کە بێ گیانە
سێبەرێکی پەشۆکاوو پەرێشانە
دەموچاوێکی ساردو غەمبارو تاریک
دەتوت گیانی مردوویەکی سەرگەردانە

لە توندی با رووناکی مۆم کوژایەوە
سێبەری سەر دیوار هیچی نەمایەوە
کەس نەیپرسی ئەوە کێ بوو، بەرەو کوێ چوو
کە چەند ساتێ لەم ناوەدا سووڕایەوە!

ئەوە منم ماندوو لەم کونجە تاریکا
کەوا جەستەی کەنەفتم لە گیان جودایە
ئەگەر من سێبەری خۆمم دەسا خوایە
گیانی ئاوارەی من کێیە، لە کوێدایە؟

*****

## فاڵی حافز

هاتە ژووریٚ لێو بەخەندەو تەوێڵ بەرین
دانیشت لاما و تۆزی خەمی پەخشانەوە
حافزی خۆشەویستی نا بە سنگیەوە
ترسم لیٚ نیشت" بڵێی چی دەور بکاتەوە!"

بەناز چاوی نوقاندو پەڕەی کردەوە،
لەو پەڕی شادییا دەستی بە سەماکرد
لە ئامێزی گرتم و پێکەنی و وتی
"مژدە گەیشت کە رۆژگاری غەم نامێنیٚ"
هەزار ماچی ئەو گۆرانیەی ئوستادم کرد
هەزار رەحمەت لەو گیانە پاکە یادم کرد!

*****

# دایک هەبوون

**داگرتنی تاج لەسەر عەرشی ئاسمان**

**لەسەرنانی ئەو تاجە تا ئاخر زەمان**

**بە بەهەشتی چی ئارەزووە، گەیشتن**

**هەر هەناسە جۆرێ هەنگوین لەجام کردن**

**بەرۆژ لەناو هەزارەها نیعمەت و ناز**

**بەشەو بتێکی وەکوو مانگ لەلات، دڵخواز**

**شەبەق وەک خۆر لەسەر بانی گێتییەوە**

**سەر ڕووی جیهان یەکپارچە ڕۆشن کەیتەوە**

**شێوان وەکوو مانگی سەرچاوەی خەیاڵات**

**بەئاسمان و ئەستێرە ناز بکەی خەڵات**

**وەکوو نەسیم لەکێڵگەی سەوزی جیهانا**

**باڵ تێکەڵ کەی لەگەڵ باڵی کۆترانا**

**حیشمەت و تەختی سلێمان بەدەست بێنی**

**خۆت بە شکۆو موڵکی ئەسکەندەر گەیەنی**

**هەتا ئەبەد بژیت لە قوللەی دەستەڵات**

**بۆت ملکەچ بێ هەرچی وجوودە و کائینات**

**هەمووی پێشکەش بەتۆ کە خۆشترە لای من**

**لەززەتی یەک دانە لەحزەی دایک هەبوون**

*****

# بەدەست نەهاتوو

ئەتۆ وتت:

-"وەکوو هەتاو هەڵدێم لەلات

وەك مانگ شەوێ لەپەنجەرەوە دێمە لات

حەیف کەوا هەتاوێ بووی

کات زەردەپەڕ

ئەفسووس کەوا بووی بەمانگێ

کاتی سەحەر!

*****

# فریوی تاڵ

ویستم ئەو دوو چاوە فریوکارە
لەپەرەی خەیاڵ دەرکەم ئەمجارە
ویستم لەدیدە و دڵێکی دییا
بگەرێم بەدووی سەفای دۆستییا
درێغ لەگەڵ گشت هەناسەیەکما
دیم باسی عیشقی تۆم لەسەر زارە!

ویستم دروست کەم لانەیەکی دی
ویستم پەیداکەم هاوزمانێ تر
رۆشتم تا نیوەگیانی لاویی خۆم
بهاوێژمە بەرپێی یارێ تر
ئەی داغ تا زیندووم یادی نێو نیگات
دەمخەڵەتێنێ دیسان جارێ تر!

پەنام بۆ مەی برد بەڵکوو دوور لەتۆ
بتوانم دوایی بەخۆم بهێنم
ئەم داخی نائومێدی و حەسرەتە
لەسەر پەڕەی دڵ هەڵبوەرێنم
لەهەر پێکێکا وێنەی تۆم بینی
ئیتر لەکام قوڕ خۆم بگەوزێنم

ئیمشەو لەتاوی غەم و کەسەرا

ئاگر لەنامەکانت بەرئەدەم

ئێستاش ئەوا من لەگەڵ ئاگرا

ژان جێ ئەهێڵم خۆشحاڵی ئەکەم

یادگاریی تۆ ئەنێمە ژێر پێ

گاڵتە بە ئەشکی فێڵبازیت ئەکەم

مۆمی هیوای شاعیرێکی ناکام

بەدەستی تۆی نازفرۆش کوژاوە

هەر سات لەباوەش یەکێکا بنوو

هەردەم خۆت لە جەستەیەک بساوە

نەفرینم لێ بێ گەر یادت بکەم

حاشا گەر ناوت بێنم لە ناوا

یەک جار پەیمانم داو قەت نەمشکاند

سەدجار پەیمانت بەست و شکانت

ئیتر پێت ناڵێم کە چیت پێ کردم

دی ناپرسم لێت شوێن و مەکانت

پێکی فریوی تاڵی تۆم نۆشی

با هەر وا مەست بم، هۆشیاریم لەچی!

*****

## سێبەرەکان

لەبێدەنگیی دڵگیری نیوەشەوا

بەناو کۆڵانانا رێمان گرتە بەر

رازمان ئەگوت بۆ یەکتری هەردوکمان

شادو خەمبار لەم دنیایە بێ خەبەر

جەستەی گەرم لە عیشق و تاسە و داوا

گەرم شانی توند کردبوو لە شانم

نازی ئەو بازوو بە بازوو ڕۆینەی

موچرکەی نەرمی ئەڕشتە ناو گیانم

لە نیگایا، لەگەڵ شەرم و پارێزا

ئەدرەوشا ئارەزوویەکی بەتین

لەدڵی من بە گشت خەمبارییەوە،

شەپۆل ئەیدا تاسەیەکی ئاگرین

دوور لە چاوی ئەغیار بەو مانگەشەوە

چاو لە چاوی یەکتر گەرمی تەماشاین

هەر ساتەی سەد رازمان دەدرکان، هێشتا

لە تای قسەی نەوتراوا ئەسووتاین

لەسەر دیوارەوە گوڵی نەستەرەن

سەریان کێشا لەگەڵ تەپەی پێمانا

مانگ لەسەربانەوە لەدووی ئێمە بوو

ئەوین کڵپەی ئەکرد لە دەمارمانا

بێباک و دڵگەرمتر، سایەکانمان

توند گوشاریان بۆ یەکتری ئەهانی

تا لەناو کۆڵانا بە سەد ناچاری

وازیان لە ئاوێزانی یەکتر هانی

دیسان کاتی لێک دابران هاتەوە

سینە لەرزی و دڵ خەفەت دایگرتەوە

لێوی لەرزیو زەردەخەنەی لێ برا

فرمێسک لەسەر رووی خەونەکان نیشتەوە

چاوی گیانی من بە ناکامی گریا

بریقەی ئەشک لەسەر چاوی ئەو نەخشا

نەستەرەنەکان سەریان بردەوە ژوور

مانگیش بەرەو ژێر پەڵە هەورێ کشا

تینوو، تەنیا، گیانم ماندوو، پەرێشان

بەناو دڵی شەوا رێگەم گرتە بەر

هەتا بگریم لە غەمیدا وەکوو شێت

## گوڵ و بولبول

لە ئۆسکاروایلدەوە

گەلاڕێزان بوو کە نەوجوانێ
جارێ رێی کەوتە ناو گوڵستانێ
روخساری جوان و بالا قیت وەستاو
سیمای خەماوی لە ژانی هەناو
دەیڕوانیە جەنگەڵ و کێو هەردەم
دڵی شکابوو لەدەست دەرد و غەم
لەگەڵ گوڵزارا هاتە گفتوگۆ
دەردی دڵی خۆی هەڵڕشت لەسەرخۆ
ئەیوت ئەو یارەی بێ میهرو وەفا
دوێنێ بەمجۆرە بۆ دۆستان دووا
"لەو ئاهەنگەدا لەناو سەوزەگیا
هەرکەس بیەوێ سەمام لەگەڵ کا
ئەبێ بۆم بێنێ گوڵی سوور و جوان
ئەگەر چووەتە ئەوپەڕی جیهان"
جا چارەم چییە لەم دەشت و سەحرا
گەر گوڵی سوورم بۆ نەبێ پەیدا!

لەسەر چڵێ بی کە لەوێدا بوو

بولبولێ قسەی لاوەی گوێ لێ بوو

بینی بێچارە و گرفتار دیارە

دڵ بریندراو ئێجگار غەمبارە

وتی پێویستە من دڵی شادکەم

گیانی لەکۆتی خەفەت ئازاد کەم

رۆیشت تا دەشت و بیابان تەی کا

بەڵکوو گوڵێکی سوور بکا پەیدا

هەرچەندە گەڕا ئەنجامی نەبوو

کە لەوناوەدا گوڵی سوور نەبوو

بێجگە لە گوڵێ بە پەڕەی سپی

یک دانە گوڵی لە گوڵزار نەدی

پێی وت ئەی هاوڕێ، ئەی یاری نازدار

گوڵێ وەکوو خوێن لەتۆم تەمادار

هەرچیت لێم بوێ بۆتی ئەهێنم

خۆشترین ئاواز لەبۆت ئەخوێنم

وتی ئەی بولبول، ئارامی گیانی

ئەو گوڵەی کە تۆ لەدووی وەیلانی

نرخی تا بڵێی ئێجگار گرانە

گەر راستت ئەوێ قیمەتی گیانە!"

بولبول ئەم هەموو ڕێیەی بڕیبوو

لەدەردی عاشق خەبەری هەبوو
وتی " شکۆی عیشق نیشانت ئەدەم
دە هەستە ئەوا گیان فیدا ئەکەم"
گوڵ وتی " سینەت بخە سەر چقڵم
تا دڵی پڕ خوێن باتە بەر چقڵم
گەر خوێنت لەسەر پەڕەم بپرژێ
ئەم گوڵە سپیەم سوور هەڵئەگەرێ
وەکوو گوڵاڵە سووری سوور ئەبێ
هەر وەکوو دڵی عاشق سوور ئەبێ
بەدرێژایی شەو هەتا بەیانی
ئاواز بخوێنە هەتا ئەتوانێ
شەوێکی خۆشە، پاک مانگەشەوێ
ئاووهەوای وا کەم دەست ئەکەوێ

بولبول سەرسینگی خۆی کرد بەسپەر
مەستانە چووە باوەشی خەتەر
چقڵی ئەو گوڵە هەموو تیژ و زۆر
چەقییە دڵی دڕکی خوێن خۆر

سینەی گوشار دا بەسەر دڕکا
خوێن پرژا بەسەر لق و پەلکا
پەڕەی گوڵ سوور بوو لە خوێنی دڵیا
خۆشەویستی بوو لەدڵ و گڵیا

سەحەر بولبول ڕووت و بێ نەوا بوو
دی لەدەست ئازار ناڵەی نەمابوو
گیانی لەسەر لێو دڵ شەقار کراو
پەڕو باڵ بەسەر دڕکا پرژاو
گوڵ بەدەست لەناو گڵ و خوێن گەوزاو
ملی ڕێگەی گرت بەرەو شوێنی لاو

هەر کەسێ ئەیدی و لای وا بوو گوڵ بوو
پارچە پارچەی جگەری بولبول بوو

زۆر دڵی سووتا لە غەمی ئەوا
بەدڵ دانیشت لە ماتەمی ئەوا
ماچێکی کرد و بەدوعای لێ کرد
گوڵی هەڵگرت و ملی ڕێگای گرت

دڵی حەیران بوو بە هیوا و کەسەر
ڕۆشت تا گەیشتە بەردەرگای دولبەر
کە گوڵی بۆنخۆشی دا نیشانی
کچە سەراپا ورد ورد لێی روانی
لەقەد وبالأی لاوەکەی روانی
وتی" حەیف دیاری چاکت نەهانی!"

هەرچەند باس ئەکەی لە میهر و وەفا
بەلأم شایانی ئەمن نیت بەخوا!
پێکەنی بە عاشقی ماتەمبار
خستیە ژێرپێی دڵی خەفەتبار
بە زەردەخەنە و گاڵتەو تانەوە
گوڵی هەڵپروان دای بەدەم باوە

لەدەست عاشقی و بەختی رەش هاوار
وای لەدەست پەری روخساران هاوار!

*****

# باو باران

گۆرانییەکی چینی

شەوێ لە کونجی غەما بە دڵی مەلوولەوە

خەفەت هاوزمانم و هاونشینیشم ئازار

شەوی ساردی کۆتایی پایز بوو، لەدەرەوە

با بوو، باران و هاژەی بۆرانێکی بێ قەرار

لەگەڵ ناڵەی بایەکی ترسناك شکا شووشە

لەگەڵ باران، قوڕاو و لیتە لەبان هاتەخوار

هەزارارن لەعنەتم کرد لەم جەور و قینەی باران

هەزاران نەفرینم کرد لەم تاوو تینەی باران

لەناکاوێکا یاری دڵرفێنم هاتە ژوور

هەروەکوو بگات لەناو دڵی زستانا، بەهار

لەدەستی باران و با، ئەو یارە نازەنینە

مووی پەرێشان و جلوبەرگی قوڕاوی و بێزار

هاتە تەنیشت ئاگر و جەستەیی رووت کردەوە

وەك گوڵی یاسەمین و وەکوو خەرمانی گوڵزار

لەم کاتەدا بای بەتین لەشووشەی شکاوەوە

بەسەر مۆمی لەرزیوا دەستی هێناو کردی تار

هەزار دوعای خێرم کرد بەسەر لێزمەی بارانا

سەناو ئافەرینم کرد لەباو بۆران هەزار جار

*****

## گوڵی وشك

وا دەڕوانن بەسەر نیگای ساردی منا

بەگەرمایی هەتاو، دوو چاوی رەشی تۆ

من تینووی ئەم سەرچاوەیەم، خوایە! چی بکا،

شەونمی گیانی من لە خۆری گەشی تۆ

لە تینی یەك نیگاو گوڵێکی وشك زیاتر

نیمە یادێك لەم کونجەدا لەگەڵ تۆدا

پاش ئەو شەوە خەمبارەی تۆم تیا بەجێ هێشت

یەك هەناسە لەدەستی خەم نەبووم جودا

ئەی گوڵی جوان ئەوە مانای ژینی منە

گەر گوڵێکی وشکم لەتۆ وەرگرتووە

چەند فرمێسکم رشتووە لەم تەنیاییا!

گوڵی وشکم چەند لەسەر سنگ گوشاردووە

ئەو گوڵە وشکە چیرۆکی حاڵی منە

چیت لە دڵی پرژانی خۆم بۆ بەیان کەم

لەدەردی دڵ بێ تۆ لەگەڵ کێ بناڵم

لای تۆ نەبێ دەردم لە لای کێ دەرمان کەم

*****

## ئەی هیوای نائومێدییەکانی من

سەرپۆشی رەنگ نیلۆفەریی رۆژاوا

بەنازەوە بەسەر خۆردا پێچ دەخوا

تاقەداری وشکەڵاتووی ناو پێدەشت

لەم چۆمی غرووبەدا تینوو جێ ما

***

لەشینایی ئاسمانانا، رووناکی

دەکشێتەوە بۆ کەناری ئاسۆی دوور

بەسەر لالەی سوورا، شەبەق لەئاسۆش

دێتە خوارێ لە هەور، بارانی نوور

***

ئامێزی خۆی دەکاتەوە، تاریی شەو

سەراپا توند گشت ژیان دەگرێتە بەر

بایەکی شێت هەڵدەکاتە ناو کۆڵان

تاریکایی دادەپۆشێ ژوور و دەر

***

شار بە لایەلایەی خامۆشی دەنوێ

جریوەی ئەستێرە لەسەربانی شەو

شەرابی مانگەشەو مانگ دەپیرژینێ،

بە ئەسپایی بۆ ناو پیاڵە و جامی شەو

***

بەپانتایی ئاسمان هەورێ نیوەشەو

دێت و بەرەولای مانگ هێرش دەهێنێ

پەپووی سەر سنەوبەری پیر پێدەکەنێ

شاعیرێك وشەوی تار جێ دەمێنێ

***

ئەی هیوای نائومێدییەکانی من

لە دڵی تاری ئەم شەوە ساردانا

تیشکی چاوانی تۆیە هەر وەك هەتاو

شەوق دەدا بەسەر سبەینێی منا

*****

## میعراج

وتی:" سەرچاوەی خۆرەکان ئەوێیە

ئاسمانی ڕوون بە نوور و سەفای لێیە

شەپۆلی دەریای خرۆشاوی فەزا!"

من هەر وتم:"لەویٚ بەرزتر کوێیە؟"

وتی:"لەویٚ بەرزتر دنیای دییە

جیهانێکە لەدنیای خاکی جوێیە

دەشتی پان و ئاسمانی بیٚ کۆتایی"

من هەر وتم:"لەویٚ بەرزتر کوێیە؟"

وتی:"بەرزتر لەویٚ دنیا نییە

چونکە ئەویٚ عەرشی کیبریای لێیە

دوا میعراجی ئێمە عەرشی خودایە"

من هەر وتم:"لەویٚ بەرزتر کوێیە؟"

ساتێکی کەم چاوی بڕییە چاوم

وتی:"زۆر ئەم خەیاڵە نابەجێیە!"

وتم:"بنوارە لە چاوی شاعیر

تا نەزانی قسەم گوناهی لێییە:

لەسەرچاوەی هەتاوەکانیش دوور تر

ئەولاتریش لەو جیهانی بیٚ پەیە

هەتا بەرزتریش لەعەرشی یەزدان

مەودای فرتەی مەلی فیکری ئێمەیە."

*****

# هەتاو پەرست

لەماڵ دانیشتووم لەناکاوێکا
مەرگ هات و وتی " دەی هەستە سەر پێ و،
جامەی عارییەت لەبەر فڕێ دە،
بادەی گیان سووتێن بنێرە سەر لێو"

کاتێ ئەمەوێ لەدەست مەرگ هەڵێم
پێم پێدەکەنێ و دێتە باوەشم
پیاڵە لەدەستی مردن وەردەگرم
لەرز دەمگرێ و تۆقیو، دەینۆشم

لەو دوورە و لەو شوێنە تۆقێنەرە
بێگیان و ژاکاو لە گۆڕا کەوتووم
لێوی دووپشکان لەسەر لێوی من
گاڵتەچی و خۆراکی مارو مێرووم

بە تاریکە شەو کە تەنیا مردن
لەسەر گۆڕەکان وەستاوە بێدار
پاشماوەی دووپشك و مارو مێروو
ئەلێسێتەوە و لوورەی دێ کەمتیار

یەک دوو رۆژ ئەگرین بەسەر لاشەما
پاشان خامۆشی باڵ رادەکێشێ
لە شنەی نەسیم چەند درِک دەروێ و
رووی چاڵی ترسناک دادەدپۆشێ

ساڵێ نابا تا ئێسک و پروسکم
شی ئەبنەوە لە گۆڕا بۆ خاک
ئەم یادگارە تاڵە لەیادی
رۆژگاری بێکام ئەچێتەوە پاک

ئەی رێبوارانی دەربەرندی وجوود
لەترسی مردن من هاوار ئەکەم
بنووم لەسەر سنگی ساردی گۆڕا
ئەبێ هەر ساتێ بە مار ماچ بدەم

ئەی لەو چارەنووسە دڵ سووتێنە
ئەمەیە باسی تاڵمان، ببینە
دەبا بزانین ئەم دە رۆژەی ژین
هەرچەندە تاڵ بێ، هێشتا شیرینە

من چۆن لەدەست گۆڕ تەوەللا نەبم
من کە عاشقی خۆری تابانم

گەر رۆژێ مەیلم بە مردن داوە

لەم کردەوەیەی خۆم پەشیمانم

تینووی ئەم هەوا گیانبەخشەم ئەمن

شێتی ئەم بەهار و پایزانەم

هەتا نەهاتووە مەرگ با هەستم

خۆم بە داوێنی ژینا هەڵواسم

*****

## پلیسرك

ئەستێرە خامۆش بوو هەتاو هاتە دەر
پلیسرکێك هەڵنیشت لەدەم گوێسەبان
لەو بەیانا، سەفای ئارەزوویەکم
شەوی ئەندێشەی وەکوو سەحەر نەخشان

وەك پلیسرك لەدەست داوی ئەم خاکە
خۆزگە ئەفڕیم بەرەو گوێسوانەی ئەفلاك
لە دیمەنی بێپایانی گەردوونا
تێکەڵ دەبووم لەگەڵ دنیای تەڕو پاك

پلیسرك بووما و لەسەر بانی وجوود
بمخوێندایە نەوای عیشق و سەرمەستی
سروودێ بخوێنم بە خەیاڵی شاد
سروودی عیشق و ئازادی پەرستی

پەڕەسێلکە بووماو سەربانەو سەربان
سلاوێ لە سەفای بەربەیانی کەم
بۆهەر لایە مژدەی بەهار رەوان کەم
لەهەرلاوە پەیام بە لاوان بدەم

تۆش گەر ڕۆژێ لەحاڵی من بپرسی
لە گوێبانت بۆ حاڵی خۆم بناڵم
ئەگەر باکم هەبێ لێم دڵگیر مەبە
چون دەترسم بەردێ بدەی لە باڵم

*****

## قوتابخانەی عیشق

لەکاری عیشقا چاوڕەشێ، ئوستاد
دەرسی ئەوینی منی دائەدا
سەرەنجامیش خۆی منی کرد لەیاد
منیش جگە لەو هیچم بیر نەما

*****

## مانگ و بەرد

گەر مانگ بوومایە لە کوێ بوومایە
بە شوێن سۆراغی تۆدا دەگەڕام
گەر بەرد بوومایە لەکوێ بوومایە
لەبەردەبازی تۆ ڕائەوەستام

گەر مانگ بوویتایە ڕەنگە بەسەد ناز
هەڵهاتبای یەک شەو لە گوێ بانم
گەر بەرد بوویتایە لەهەر کوێ بووما
تێکت ئەشکانم ، تێکت ئەشکانم

*****

# کۆڵان

بێ تۆ،دیسان مانگەشەوێ بەو کۆڵانەدا تێپەڕام

هەموو جەستەم بوو بە چاوو لەدووی سۆراغی تۆ گەڕام

پێکی وجوود پڕ بوو لە تاسەی دیدارت

وەک ئەوسا بوومەوە بە شێت و دڵدارت

لەرازخانەی دڵی مندا گوڵی یادت گەشایەوە

باخی سەدان بیرەوەری بووژایەوە

عەتری سەدان بیرەوەری پرژایەوە

هاتە یادم شەوێ رەت بووین پێکەوە بەو کۆڵانەدا

بەو خەڵوەتگە دڵخوازەدا هەڵفڕین و تێرتێر گەڕاین

دەمێ لەگوێی جۆگە وەستاین

تۆ هەرچی رازی جیهانە لەچاوتا بوو

من وجوودم ونی تەماشای نیگات بوو

ئاسمان ساف و شەو ئارام بوو

بەخت شاد و زەمان رام بوو

هێشووی مانگ، بۆ ناو ئاو پرژاو

لق و پۆپی درەختەکان دەستیان دابوو بە مانگەشەو

دەشت و گەڵا و بەردو شەو

هەموو مەستی سەفای شەو

لەبیرم دێ کە پێت وتم:

-"وریا بە لەم ئەوینە!

بۆ چەند ساتێ لەم ئاوەدا ببینە

ئاو ئاوێنەی ئەوینی بێ بەقایە

تۆ کە ئەمرۆ نیگەرانە، نیگات بە نیگای یەکێ

سبەی دڵت شەیدای یەکێ تر ئەبێ!

جی بێڵە ئەم شارە هەتا بیرت چێ!

من بەتۆم وت:" حەزەر لە عیشق؟ نازانم

تۆ جێ بێڵم؟ ئەمە هەرگیز ناتوانم

ناتوانم!

رۆژی یەکەم کە دڵی من بە هیوای تۆ باڵی گرت

وەکوو کۆتر لەگوێ بانی ماڵی تۆ گرتم ئارام

بەردت لێ دام من نەرۆشتم، نەتارام.."

دیسان وتم:" تۆ راوچیت و منیش مامزی سەحرام

تا بکەومە داوی تۆوە، هەرچی جێ هەیە گەڕام

حەزەر لە عیشق؟ نازانم و ناتوانم!"

فرمێسکێک لە درەختەوە کەوتەخوار

تاق تاق کەرە ناڵەیەکی کردو ڕۆی

فرمێسک لە چاوما رژا

مانگ بە عیشقت پێکەنی!

بیرمە ئیتر هەواڵت نەمایەوە

لەدامێنی خەما پاڵم دایەوە

نەتارام و دڵ هەڵنەکەنراویەوە!

***

لەناو خەما ئەو شەوانە و شەوانی تر بەسەرچووم

تۆ نەتپرسی حاڵی عاشقی مەحرووم

تۆ جارێ تر بەوکۆڵانا نەڕۆشتی

بەڵام بێ تۆ چەند زەحمەت بوو، من بەو کۆڵانا رەت بووم!

*****

## ئارەزوو

دەنگی گەرمی کێیە لەو دوور دوورەوە

گۆرانی دڵخوازی هیوا ئەخوێنێ

جارێ یادێکی تاریکم بیر ئەبا

جارێ مژدەی خۆشی ئاینده دێنێ

له تەنگانەی تاریکیی نیوە شەوا

کەلەگۆڕی تارو تەنگ تارتر ئەبێ

دەنگی گەرمی کێیە وەک سروشی شەو

هەرشەو له ڕێی دوورەوە دێتە بەر گوێ

لەقووڵایی یادما دەکشێ بەرەو ناخ

دامەنم دەگرێ و بانگم دەکا بە ناو

دەرژێ بە گوێی گیانما دەنگی دڵنەواز

چالاک و نەرم ڕۆحم دەخاتە نێو داو

چاوەکانی پەشێوی من ، ئای شەوان

چەند به یادی بێدارو له بیرا بێ

هەموو گیانم مەستی ئەم ئاهەنگەیە

وەک به تان و پۆی دڵمەوە چنرابێ

بە پانتایی ئاسمان، خەیاڵ هەڵ دەفرێ
مات و حەیران لە جێگەی ئەم نەغمەیە
لەسکووت و تاریی خەمباری شەوا
تەنیا هاوڕێی گیانی من ئەم دەنگەیە

لە ئاسمان دوو چاوی مەستی دڵ رفێن
وەکوو زوهرە وریای بێداری منن
ئەو چاوانەی ئەو کە شەوانی ڕەشم
لەشەوقی نەمریان وەك رۆژ رۆشنن

ڕووی ڕووناك و دڵگیری ئارەزووە
لەسەرووی زوهرەوە ڕازم بۆ دەکا
پێم ناجمێ تا بەرەو لای هەڵپەکەم
کە دامەنی بگرم دەستم پێ ناگا

*****

## له هه‌یوانه بچکۆله‌که‌مان دا

ساڵه‌هایه غه‌یری قاقای (به‌هار) ی خۆم ،ته‌نیا کچم

نه باغم دیوه نه به‌هار

له گژو گیای وشکهه‌ڵاتووی سه‌ربانه‌کان

هیچ نابینم

غه‌یری زه‌رده‌خه‌نه‌ی بێزار

له ته‌به‌قی غه‌م داگرتووی ئاسمانی پیر

له گه‌وا ڵه‌ی ره‌ش به‌ولاوه

نه‌م دیوه هیچ نه‌خش و نیگار

درێغا له‌م دنیای  تۆزو دوکه‌ڵ سازا

ره‌نگی گوڵاڵه‌و سه‌وزه‌گیام بیر نه‌ماوه

به خه‌یاڵی ئه‌و سروودانه‌ی شاعیران

به به‌هارا خوێندوویانه،

من هه‌میشه حه‌یف و حه‌سره‌تم کێشاوه

له‌م شاره ناشیرینه‌دا

لێره که‌وا بیری نزم و دیواری به‌رز

باڵی به‌سه‌ر ئێمه‌و چاره‌نووسی ئێمه‌دا کێشاوه

چه‌ندین ساڵه

به حه‌سره‌تی بیستنی یه‌ک ئاوازی شاد

له ئاره‌زووی بینینی یه‌ک  چڵی  سه‌وزا

لە حەسرەتی یەک تاقە کانی و درەختا

باخێکی پڕ خونچەی گولاَ،یا ئاسمانێکی ساماڵا

بە ناو تۆزو دووکەڵ و ئاسن و خشتا

من هەڵپەمە

نەک تەنیا من ،کیژی شیرین زمانیشم

کە داستانی گوڵ و دەشتی لێم بیستووە

هەڵفرینی شادمانی پەرەسێلکەی نەدیتووە

وەکوو ئەوان گەرچی داویە لە شەقەی باڵ

بەڵام تەنیا لەم ژوورەوە تاکوو هەیوان گەیشتووە

***

شەوان کاتێ لەدامێنی (حافز)ا خەو ئەمباتەوە

لە رەنگاورەنگی خەونم دا،لە باغی بەر هەتاوم دا

شیراز قەشەنگتر لە بەهەشت خونچە ئەکا

شیراز رووناکتر لە شەراب شەوق ئەدا

لە خەیاڵی خۆما منیش

لەم خەونە رەنگینانەما

لەگەڵ قاقای (بەهار)، کیژی تاقانەما

لەگەڵ هەرچی کە شاعیران بە بەهارا هەڵیان داوە

لەناو باغی وشکی بیرەوەری خۆما، شادو مەستم

***

بەڵام(بەهار)، بەهاری من

ئەم باڵ بەستە بچکۆلەیە

بە باڵی بەستراوەوە، لە هەیوانی بچکۆلەیا

لەم شارە ناشیرینەدا

لێرە کەوا بیری نزم و دیواری بەرز

باڵیان بەسەر ئێمەو چارەنووسی ئێمەدا کێشاوە

ئاخۆ بە تەنیا چی ئەکا

چاوم لێیە ،غەم داگرتوو..

لە قووڵایی ئەم حەسارا

بە حەسرەتی بیستنی یەک ئاوازی شاد

لە ئارەزووی بینینی یەک چڵی سەوزا

لە حەسرەتی یەک تاقە کانی و درەختا

باغێکی پڕ خونچەی گوڵ، یا ئاسمانێکی سامالا

سەرسام .. کزۆڵەی کردووە

لەناو هەورە دوورەکانا

چاوی بۆ ئاواتە بچکۆلەکانی خۆی نووقاندووە

منیش سەیری ئەو ئەکەم و

ژان دام ئەگرێ

*****

# دەنگێ لەخواوە ناگات

ئەی ئەستێرەکان کە لەدنیای دوور

چاوتان لەچاوی بێ تیشکی مەیە

ناوی زەوی و بەشەرتان بیستووە؟

لەناو شینایی نەرمی ئاسمانا،

شەپۆلی خوێن و دوکەڵ و ئاگرتان نەدیتووە؟

***

ئەم تەمی مەینەتەی کەوا لەناو دڵی فەزایە

ئەم هەواری ترسەی کەوا لە فەزا بەرەڵایە

ئەم سەرا تاریکەی کە لانەی ئێمەیە

بەتەمای مەحوی ئێوەیە!

***

ئەگەر گوێتان بە ناڵەی من ئاشنایە

لەو کەشتییەی کەوا بەرەو مانگ ئەچێ

لەو رێبوارەی کە تازە ئەگاتە جێ

لەم زەوییە ئاشوبگێڕە حەزەرکەن!

گەر پێی بەشەر بێتە ئاسمان

رۆژی ئێوەش وەک هی ئێمە تار ئەبێ!

***

ئەی ئەستێرە کە لەبەر چاوی منی

باوەر ناکەی لەسەر زەوی

لەهەر کوێ هەرکێ ئەبینی

لەناودەستیا خەنجەرێکی شاراوەیە

لەپشت خونچەی هەر بزەیەك

چقڵی گیانبڕی فێڵێکی لەدواوەیە!

***

ئەوەی سەلای خۆشەویستیت بۆ ئەخوێنێ

تەنیا لەبیری تاراجی دڵتدایە

گەر ئەبینی لەسەر ڕێگات چرایەك، ڕوون

ئەوە چاوی گورگێکی خۆش ئیشتیهایە!

***

سلاوی ئێمە، ئەستێرە، بەهانەیە

عیشقی ئێمە درۆیەکی پەی دەرپەیە

لە زەویدا لە زمانی هەقیان داوە

هەق بە زمانی قامچییە

ئەوی بەراست دەردی دڵت لەگەڵ دەکا

هەنسکی گریانی شەوە

***

ئەی ئەستێرە باوەڕ ئەگەی:

لەناو باخچەی بێ گۆرانیی ئەم زەمینا

چڵوپۆپی سەوزی ئاسایش شکاوە

گوڵاڵە سوورەی هاورێیەتی ژاکاوە

***

خونچەی هیوای تازەگەیو

پێش ئەوەی دەم بە پێکەنین بکاتەوە، هەڵوەراوە

ئالآی بەرزی سەروی راستی

سەری لەناو خاکی غەما لەقوڕ ناوە!

***

ئەی ئەستێرە، باوەڕ ناکەی:

ئەو شەبەقەی بە سەفاو ناز

لەناو فەزای بێ کەنارا هەڵی ئەدا

چیتر لەزەوی نەماوە

ئەم شەبەقانە شەبەق نین،

رەنگ لەرووی زەوی بڕاوە!

***

ئەو گولآنەی شەفەق کەوا ئەپشکوتن

عەسران لەشەپۆلی نوورا

لەسەر زەوی تۆوی نەما.

رەنگی سوور و شینی شەفەق

دڵی خەڵکی لەخوێن و خۆڵا گەوزاوە

ئاگرو دووکەڵی بۆ ئاسمان هەڵساوە!

***

ئەو هەورە نەرمەی وەک حەریر

کە پێخەفی بووکی مانگ بوو

وەک لۆکەی گەرمی کۆنەیە!

***

ئەستێرە، ئەستێرەی غەریب!

لە حاڵی بەشەر و زەمین مەپرسە!

لە ژێر شریخەی فیشەکی داغدا

لە سەفای گۆنای ئاگرین مەپرسە!

لەژێر زللەی بەژانی ئەشکەنجەدا

لەنەمانی ڕووی نازەنین مەپرسە!

لەبەرچاوی منداڵانی بێ پەنا

لە نیگای دایکانی شەرمین مەپرسە!

لە م دۆزەخەی وا لە جیهان جودایە

لەم دۆزەخەی لەبەر چاوی خودایە

دەربارەی گڕی کوورەو لیژنە جەستە،

لەمەڕ هاواری زیندوو لەناو کڵپە،

لەوە زیاتر مەپرسە!

لەوە زیاتر مەپرسە!

***

ئەستێرە، ئەستێرەی غەریب!

مەگەر یەزدان بیری ئێمەی نەماوە؟

ئەگینا بۆ بە فریای ئێمە ناگاتێ؟

گریەی ئێمە گەیشتە حەوت ئاسمان

کەواتە بۆ دەنگێ لەخواوە ناگات؟

***

بەسە باسی ئەم گۆرانیی ژانانە

بەسە باسی ئەم ئەفسانە تاڵانە

وازم لێ بێنە ئەی ئەستێرەی شەوگەڕ

لەداستانی رەشی مرۆڤی زەمین

خەوی شیرین لەچاوانی تۆ تاڵە

گوێچکەت کە ئارەزووی گۆرانیی نیە

ئاهوناڵەی ساردی من لای بەتاڵە!

***

ئەی کە دەستم ناگاتە دامێنی تۆ،

فرمێسکی من ئەرژێ لە دامێنی تۆ!

***

لەگەڵ سروەی دڵگیری بەربەیانا

چاوی ماندووی تۆ ئەنیشێ

لەحەساری شەوی تارا، بەبێ تۆ

هەنسکی گریانی شەوم

لەگەرووما قەتیس ئەبێ...

شەو شاد.

*****

# لەگەڵ حافزدا

لەناو پەرستگای وجوودا

مرۆڤ لە کونجی میحرابی خواستە ئاگرینەکانیدا

لەسەر بەرماڵی رەنگینی حەسرەتگەلی دڵسووتێنەر دانیشتووە

لەدەستیدا هێشووی پڕ دانەی تەزبیحی حەزو تاسەی جۆراوجۆرە

بەرەو لای خوا دەروانێت و دڵیشی پڕ ئارەزووە

بە کزۆڵی —ئای خۆزگەم- ێک لەناخی دڵی دێتە دەر

شەوو رۆژی (درێغی) رابوردوو و (خۆزگەی) داهاتووە!

***

ئیمشەو هەموو کۆلآنی ئارەزووەکانم چراخانە

زەوی و ئاسمان نوور بارانە

کۆتری باڵ نەخشینی تاسەم

بەهەشتی پڕگوڵی خەیاڵمی لە بن باڵی ناوە

سەفای پەرستگای وجوودم سەیرانییە

لەهەرلاوە بزەی لێوی ئەستێرەکان دەرژێنە ناو چلچرای مانگ

دنیا نوستوو

تەنیا منم لەم پەرستگا، لەم میحرابەدا دانیشتوو

***

حەزم دەکرد کۆت لە پێی گیانم دەربێنن

تا بتوانم بفرم هەتا سەربانی هەور

لەوێشەوە بە کەمەندی کاکێشانا تا بەردەگای عەرش ئەرۆشتم

قاوم ئەدا، ژان و دەردم لەبەر دەرگا

تا بلەرزێ کۆشکی سەد پایەی کیبریا

***

بلێی شەوێ لەم شەوە بێ ئەنجامانە

لەهاوارێکی ناوەختا

-بەسەر ئاوریشمی ئاسمانا- خەو لەچاوی خوا بتۆرێ!

***

حەزم دەکرد دنیا جۆرێکی تر بووایە

میهرەبانیی خوا لەگەڵ بەندەکانیدا زیاتر بووایە

یادێکی ئەم مرۆڤە بێچارەیانەی بفەرمووایە

حەزم ئەکرد لەبارەگاکەی خۆیەوە زنجیرێکی درێژی شۆڕ دەکردەوە

کە مەزڵوومان لە خوارەوە بەو زنجیرە

خوداوەندیان لە دەردی خۆیان ئاگادار دەکردەوە!

***

چەند شیرینە، بێگوناهێ دادی خۆی لە خوا وەربگرێ!

چەند شیرینە بەڵام ئەمن،

حەزم دەکرد ئەهلی پارەو زۆر لە ناکاو،

لەهەرلاوە رێیان بەخەڵك نەگرتایە و زنجیرەکەی خوایان نەپێچایەتەوە!

***

حەزم دەکرد دنیاماڵی خۆشەویستی و دڵپاکی بێ

حەزم ئەکرد خەڵك هەمیشە کۆك بوونایە

تەماعیان لە ماڵی یەکتر نەکردایە

بۆ یەک کوشتن، چاکیان لێ هەڵنەکردایە

لە نائومێدیی یەکتردا، بۆ ئومێدی خۆیان چاویان نەگێڕایە!

هەروەکوو کەمتیاری خوێنخۆر، هێندە چنگ و ددانیان تیژ نەکردایە!

***

چەند شیرینە، کاتێ سینە لەخۆشەویستی لێوانە

چەند شیرینە، کاتێ خۆری هاورێیەتی لەئاسمانی زەمانەدا درەخشانە

چەند شیرینە کاتێ ژیان بە فڕ و فێڵ بێگانەیە!

***

حەزم دەکرد دەستی مەرگیان لە دامێنی هیوای ئێمە وەدوور دەنا

لەم دنیایەی بێ سەرەتاو کۆتاییا

لەم سەحرایە کە بێجگە لە تۆز و خاکمان هیچ نامێنێ

خودا چیتر تووشی ناکامیی ناوەختی نەدەکردین!

ناڵێم باڵندەی زەمانی لەناو قەفەس ئەسیر دەکرد!

ناڵێم بەخت و تەمەنی بێ بڕانەوەی بەخەڵک دابا

ناڵێم کەوا عەیش و نۆشی بەخۆرایی بە خەڵک ئەدا!

گەر تەنیا ئەم هەشت نۆ ڕۆژەی وجوودمانی بێوەی دەکرد!

لە ناڵەی سەختی بێ دەرەتانان دڵی جووڵەی دەکرد!

***

حەزم دەکرد ئەوینی منیان نەدەکوشت

ئەیانبینی سەفای حەزم- کەوەک هەتاو درەخشان بوو-

لە چڵی داری وجوودم ئاوا ئاسان نەیاندەچنی

گوڵی عەشقێکی وا گەشیان نەدەپروان

نەیان دەدا بەدەم بای نائومێدیوە

هێندە تووشی سووکایەتییان نەدەکرد

ئاوا تەنیا وێڵی بیابانی خەمیان نەدەکردم!

***

حەزم دەکرد جارێکی دیش ئەوم لەلای خۆما دەدی

بەیادی دیداری یەکەم، ڕادەمامە چاوی رەشی

جارێکی دیش دڵم وەکوو یەکەم دیدار لەبەردەمیدا دەجۆشا

بادەی یەکەم زەردەخەنە لەناو پیاڵەی وجوودمدا دەخرۆشا

خەمی گەرمی لەگونجی رازی دڵمدا کنەی دەکرد

حەزم دەکرد دەستی ئەوین —وەک یەکەم رۆژ- وجوودی هەڵدەتەکانم

***

حەزم دەکرد کەوا سەقفی پەرستگای وجوود بڕمایە

چەپەڵی و ناشیرینییەکان لەژێر خاکا دارزایە

بەهارێکی هەمیشەیی ئامێزی بکردایەوە

جیهان لەناو شەپۆلی جوانی و چاکیدا بگەوزایە

بەهەشتی عەشق زەردەخەنە بیگرتایە

لە ئاسمانی کپ و شینا

پەرەسێلکەی میهر و دۆستی لە شەقەی باڵی دابایە

لەسەربانان زەنگی ئازادی زرینگەی بهاتایە

***

مەڵێ "ئەم خەیاڵە خاوە!"

مەڵێ "گیانی مرۆڤ هەمیشە سەرگەردان و دۆڕاوە!"

ئەم گەردوونە گەر لەبەر یەک هەڵناوەشێ

ئەم ئاسمانە گەر ناتەپیَ

وەرە دەی با "سەقفی فەلەک بشکێنین و شێوەیەکی کەی بۆ رێک کەین"

بە دڵشادی " بپرژێنین گوڵ و بادە لە ناو پێک کەین"

*****

## پێک ئەگەر شکا...؟

ژیان بەلای منەوە شەوگەلێکی بێ مانگەشەوە

هۆنراوەم وەک نیلۆفەری ژاکاوی کەنار زۆنگاوە

هەوری بێ بارانی خەمم،

چقڵی وشکی سنگی کێوم

***

ساڵەهایە ئامێزی من لە هەموو حەزێک خاڵییە

ئاوازخوێنی جوانی و ئەوین بووم بەڵام ئاهـ

ئێستا خامۆشی خامۆشم

یادی لە خەیاڵ نەماوم

***

رۆژ، هەروەکوو گوڵ بەسەر کێوا دەپشکوێ

دەژاکێ عەسر، ئەم تازە شکۆفەیە- لە کپی و خامۆشیی دەشتا-

رۆژەکان ئاوا هەڵپروان

ساتەکانی بێئۆقرەی عومر

وەک پلیسرکی بێئارام لە فڕینا

لەگەڵ سەرەسامیی حەسەرتی رێبوارانا!

***

ئێستاش شیعر و ساز و بادە ئامادەیە

من- کە جامی وجوودەم پڕ لە فرمێسکە- وا دەپرسم:

-"ئایا دەبێ بەبادە زەحمەتی زەمان فەرامۆش کەین؟
بە فێڵی شیعر دەبێ ژیان بە رەنگێکی دیکە خۆش کەین؟
بە سۆزی ساز دەبێ ناڵەی گیانمان ون کەین؟"

***

ناڵەی من لەدەرو دیوار دەتکێ
ئاسمان، بەڵام سەراپا گوێیەو بێ دەنگە!
سۆراخ نابەم هاوزمانێ کزۆڵە پێی بڵێم- درێغ-
چیتر شەراب ناکا مەستم
لە شیعری جوان خاڵی بووە پێکی هەستم
سازم یەکپارچە هاواری بێ وەڵامە!

***

ئارام ئارام لە دوورەوە
خۆر، هەروەکوو گوڵ بەسەر کێوا دەپشکوێ
رووناکی بە ئاسماندا سەردەکەوێ
پیاڵەی زەرراتی وجوود پڕدەبێ لە شەرابی نوور،
بەڵام ئەمن:
هەروا لە تاریکایی شەوە بێ مانگەشەوەکانا
هەروا ژاکاو لەگوێی گۆما
هەروا لێوان لە دەردو خەم، پرسیار دەکەم:
-" پێک ئەگەر شکا؟
ساز ئەگەر پسا؟
چیتر هۆنراوە گەر دڵی نەگرت؟"...

*****

## خۆش بەحاڵی خونچە نیوەکراوەکان

بۆنی باران، بۆی سەوزایی، بۆنی خاك

چڵی تەڕی باران لێداو، چڵی پاك

ئاسمانی شین، هەور سپی

گەڵا سەوزەکانی بی

***

عەتری نێرگز، سەمای با

نەوای شەوقی پەرەسێلکەی بەختیار

خەڵوەتی گەرمی کۆترە مەستەکان...

وردە وردە وا دەگاتە جێ، بەهار

خۆش بەحاڵی رۆژگار

***

خۆش بەحاڵی سەرچاوەکان، دەشتەکان

خۆش بەحاڵی تۆوەکان و شینایی

خۆش بەحاڵی خونچە نیوەکراوەکان

خۆش بەحاڵی کچی مێخەك، کە بزە دەیگرێ بە ناز

خۆش بەحاڵی جامی لە مەی پڕ کراو

خۆش بەحاڵی خۆرەتاو

***

ئەی دڵی من گەرچی لەم رۆژگارەدا

بەدڵ هەرگیز جلی رەنگین ناپۆشی

بادەی رەنگین هەرگیز لە پێك نانۆشی

نوقڵ و سەوزە لە خوانتدا نیە

بادەی دڵخواز لەناو جامتدا نیە

***

حەیف لە تۆ گەر وەکو گوڵ لەگەڵ نەسیم نەکەی سەما

حەیف لەمن گەر مەستی خۆرەتاو نەبم

حەیف لە ئێمە گەر چێژ وەرنەگرین لە بەهار

***

ئەگەر شووشەی غەم نەکێشی بەسەر بەردا

ئەو حەوت رەنگەی کە هەیەتی دەبێ بە حەفتا

*****

## سەرسامی

سەرسام، ئەرۆم بەناو رێبوارەکانا
کوێرانە لە نیگاکانیان ئەڕوانم
ئەم هەموو ژانە لە بوونماو من لاڵم
ئەم هەموو هەرا لە پاڵماو دووریانم

لە دڵما چیتر نە هەستە و نە ئەوین
لە گیانما چیتر نە شەوقەو نەفەریاد
دەشتم بەڵام دەشتی بێ ناڵەی مەجنوون
کێوم بەڵام کێوی بێ تەشوێی فەرهاد

بێ ئارەزووم هیچم بەڕاستی پووچم!
بێ ئەندێشەم وەکوو ئەو بەرد و دارەم!
هاوسەفەری چیرۆکی ناخۆش و سەیر
رێبواری کۆڵانی تەسکی ئێوارەم

گشت ئەو خۆرانەی لە ناخا گڕاوم
کانی غەم بوون ڕژان لە چاوی تەڕما!
کۆشکی هیوای هەتا مانگ هەڵچنراوم
بوو بە وێرانەی غەم ڕما بە سەرما!

بەلەمی وێڵم لە دڵی شەپۆلا

کە نابینیٚ نە کەشتیوان نە خودا

شەپۆلی بێزاری کپی و تاریکیم

ئەکێشم ئەم گیانەی لە ئومێد جودا

سەرسام ئەڕۆم بەناو ڕێبوارەکانا

ئەژمێرم شیشی بەر پەنجەرەکان

ئەڕوانم وەک کوێر لە نیگای ڕێبواران

دێتەگوێم زیکەزیکی سیسرکەکان

*****

# جادووی بێ تەئسیر

پڕیکە پێک

کەئەم ئاوە ئاگرینە

ماوەیەکە چارەی حاڵی بەدم ناکا

***

ئەم پێکانەی کە یەک یەک خاڵی ئەبنەوە

دەریای گڕن دەرژێنە ناخ

تۆفان دێنن کەچی ئەمن ئاو نامبا

***

من بە ئەسپی سەرکەش و جادوویی شەراب

تا جیهانی بێ کەناری خەیاڵ رۆشتووم

هەتا دەشتی پڕ ئەستێرەی ئەندێشەی گەرم

تا سنووری نەزانراوی مەرگ و ژیان

هەتا باخچەی بیرەوەرییە سرکەکانم

هەتا شاری یادەکانم

چیتر شەراب

ئەولاتری کەناری جێی خەوم نابا!

***

ئەی هەڵۆی عیشق

لەسەر پۆپەی لوتکەی تەماویی دوورەوە

بفڕە بۆ پێدەشتی خەماویی عومری من

بمبە بۆ ئەو شوێنەی کەوا شەراب نامبا

***

ئەو بێ ئەستێرەیەم کەوا هەڵۆش نامبا!

***

لەرێی ژینا

بەم هەموو هەوڵ و ئاوات و تینوێتییەوە

هەرچەند بەدڵ ناڵە ناڵمە: ئاو.... ئاو!

چیتر فریو تووشی سەرابێکم ناکا!

***

پرِیکە پێک...

*****

## فرمێسکێک لەسەر رێی مێژوو

لەو رۆژەوە کەدەستی حەزرەتی قابیل
ئالوودە بوو بە دەستی حەزرەتی هابیل
لەوەتی کوڕانی ئادەم،
سەرکاروانی پەیام هێنەرانی یەزدان،
لە خوێنیانا
زەهری تاڵی دوژمنایەتی خرۆشا
مرۆڤایەتی مردبوو
گەرچی ئادەم خۆی زیندوو بوو
***
لەو رۆژەوەی براکانی، یوسفیان خستە چاڵەوە
لەو رۆژەوەی بە قەمچی و خوێن دیواری چین بنیات نرا
مرۆڤایەتی مردبوو
***
ئینجا دنیا پەیتا پەیتا پڕ بوو لە خەڵک
ئەم ئاشەش هەر گەڕاو گەرا
سەدەها ساڵ لە مەرگی ئادەم تێ پەڕا
بەڵام درێغ
ئادەمێتی وەنەگەڕا
***

**ئەم سەدەیە**

**رۆژگاری مەرگی مرۆڤایەتییە**

**سینەی دینا لە سیفاتی چاك خاڵییە**

**باسی پاکی و نەفس بەرزی و پیاوەتی بێ عەقڵییە**

**باسی عیسا و موساو موحەممەد بێ جێیە**

**سەدەی پیاوانی وەکوو مووسا چۆمبی یە**

*******

**ئەمن کە لە ژاکانی یەك لقە گوڵێ**

**لە نیگای بێ دەنگی منداڵێکی نەخۆش**

**لە هاواری کەنارییەکی ناو قەفەس**

**لە غەمی تاقە پیاوێکی زنجیرکراو**

**تەنانەت هی پیاوکوژێکی لەدار دراو**

**دەڕژێتە چاوم فرمێسك و دڵ پڕ دەبێ**

**ئەم رۆژانە پێکم پڕیەتی لە ژەهرو**

**گۆزەشم پڕ لە زەهری مار**

**چۆن ئەتوانم بەمەرگی ئەو باوەڕ بکەم؟**

*******

**قسە لەسەر ژاکانی یەك گەڵا نیە**

**وای دارستان بە بیابان تەبدیل ئەکەن!**

**لەبەرچاوی خەڵکی دەستی خوێناوییان ئەشارنەوە**

**هیچ ئاژەلێك بە ئاژەڵی تری ناکا،**

**ئەوەی ئەم نامرۆڤانە بەسەر مرۆڤی ئەهێنن**

*******

قسە لەسەر  ژاکانی یەک گەڵا نیە

بڵێین مەرگی کەناری  لە ناو قەفەسا مەرگ نەبوو

بڵێین هەرگیز لە جیهانا یەک چڵە گوڵیش  نەڕوا

بڵێین جەنگەڵ هەر لەئەسڵا بیابان بوو

لە چۆڵێکی نەفەس گرا،

لەناو خەڵکی بەم هەموو نەهامەتییە خۆ ڕاگرا

باس  لە مەرگی ئەوین و خۆشەویستییە

قسە لەمردنی مرۆڤایەتییە

*****

# دوا پێکی ئەم جامە

هەموان ئەپرسن

"–لە خورەخورِی سیحراویی ئاوا

–لەشەکانەوەی دڵگیری گەڵا

–لەیاریی هەوری سپیی شینایی بەرزو هێمنا

–چی نیهانە وا

بەرەو قوڵایی خەیاڵت ئەبا؟"

"–یا لە خەڵوەتی کپی کۆترا

–لە هەوڵی بێ ئەنجامی شەپۆلا

–لە پێکەنینی ئەم جامەدا یام

–چی نیهانە وا کە چەندین سەعات

ورد تێی ئەڕوانی وا کش و سەرسام؟"

نا نەلەبیری هەورو ئاوام من

نەبیری گەڵام

نەئەو شیناییەی وا بەرزو هێمن

نە ئەو ئاگرە داغەی خزاوە بۆ ناو دڵی جام

نەهی تەنیایی کپی کۆتران

نا من لە بیری ئەمانەدا نیم.

سروەی درەختان لە بەیانییا

سەمای عەتری گوڵ لە ئامێزی با

هەناسەی پاکی گولاڵە لەناو سینەی کوێستانا

رازو نیازی پەرەسێلکەکان لەگەڵ بەیانا

ترپەی پەیاپەی دڵی کائینات لە پەڵە گەنما

ڕەوتی ڕەنگ و تین لەگۆنای گوڵا

هەموو ئەمانە ئەبینم، ئەبیەم

بەڵام من بیری هیچ کامیان ناکەم

من تەنیا لەتۆ بیر ئەکەمەوە

ئەی پاکت چاکی

لەبیری تۆدام تەنیاو تەنیا

هەموو ئان ودەم

لەهەر شوێنێ هەم

حاڵم هەرچی بێ بیری تۆ ئەکەم

ئەمە بزانە

بەس تۆ بزانە

وەرەلام ئەتۆ

بمێنەرەوە لای منی تەنیا

بمێنەوە تۆ

لەجێی مانگەشەو تاریکە شەوان

تۆ بدرەوشێوە

لەجێگەی هەرچی گوڵی دنیایە، گیانم بەقوربان

تۆ پێ بکەنە

ئەوا من کەوتووم لەبەر پێی تۆدا

لەمووی بڵندت برێسە هەودا

تۆ خۆت بمگرە

تۆ خۆت بم بەستە

خۆت بکە داوا

پەرەسێلکەکان، وەڵامەکانیان خۆت بیدەرەوە

داستانی هەور خۆت بیگێڕەوە

بمێنەوە تۆ

دەسا لە دڵی پیاڵەی وجوودا

تۆ خۆت بجۆشە

لە پێکی گیانم ئەم یەک نەفەسەم لە دڵا ماوە

دەسا دوا پێکی ئەم جامە بۆشە

تۆ خۆت بینۆشە

*****

# شەرابی شیعری چاوەکانی تۆ

خەیاڵێکی کورت لە شەوێکی بێ بەیانیدا

تا بەیانی من ئیمشەو خەو نامباتەوە

بیرو هۆشم یەکپارچە لای بەیانییە

لە خواستنی تۆ وجوودم لێوان لێوە

زەمان لەناو نوێنی شەوا نوستوو و بێدار

هەوا کپ و شەو خامۆش و ڕێگەی ئاسمان کراوەیە

خەیاڵم هەر وەکوو کۆترە کێوی دەدا لە شەقەی باڵ...

بۆ ئەوێ کە قەرەجە جادووگەرەکان پرچی شەوگار دەهۆننەوە

بۆ ئەوێ کە ئەستیرەکان لەسەربانی تەلارەکان مەشخەڵیان

دادەگیرسێنن

بۆ ئەوێ کە کاهینانی پەرستگای تار، ڕەنگ لێ دەدەن

بۆئەوێ کە لەپشت پەردەی شەوگارەوە کچی خۆری بەیانی ئارایش

دەکەن

ئەو بەیانییە پڕ لە سیحرو خەیاڵییە

ئەو بەیانییەی ڕێگای خەوی من گیراوە

ئەو بەیانییەی لەسەر پەردەی خەیاڵی من نەخش بووە

ئەو بەیانیەی کەوا ڕۆژی ژووانمانە

ئەو بەیانییەی ڕۆژی ئامێز و ڕامووسانە

ئەو بەیانییە، ئەو بەیانییە...

...تا بەیانی من ئەمشەو خەو نامباتەوە!

***

زەمان لە پێخەفی شەوا نوستوو و بێدار

تاریکایی تەون ئەچنێ

لەدەست شنەی ساردی پایز، چرای مانگ لەرز گرتوویەتی

دڵی بێ ئۆقرەو ئارامم پڕ لە تاسە

چاوم بۆ هەرلا دەروانێ، بەیانییە!

لە پشت تاریکیی شەوەوە، بزەی سەحەر نیشانییە

کەنارییەکان سروودی بەیان دەخوێنن

***

...لەوێدا من چاوەرێی تۆم لەناکاوا

دەتبینم لە دوورەوە دێی

لە دوورەوە دەتبینم وا پێ دەکەنی

لە دوورەوە دەتبینم وا دێیتە پێش و پێدەکەنی

نیگام مات لێت رادەمێنێ

هەموو جەستەم دەبێتە چاو

دەتبینم لە ئامێزمدا

فرمێسکی شەوقم دەبێتە شەونمی سەر پەڕەی گوڵی روخساری تۆ

جەستەم لەناو بادەی شیعری چاوی تۆدا دەسووتێنم

شیعرت لەبۆ دەخوێنمەوە

شیعرم بۆ دەخوێنیتەوە

بزە شیرینەکانت گشت بە ماچ دەچنم

***

ئەگەر بەختیش یاریم بدا

لە باوەشتا...

... ئەی درێغا!

***

تاریکایی تەون دەچنێ

لەدەست شنەی ساردی پایز، چرای مانگ لەرز گرتوویەتی

هەوا کپ و شەو خامۆش و رێگای ئاسمان کراوەیە

زەمان لە پێخەفی شەوا نوستوو و بێدار

*****

## باوەڕ بە بەهار بکە

پەنجەرەکە بکەرەوە، کەوا نەسیم

ئاهەنگی

رۆژی لەدایکبوونی ئەقاقییەکان سازدەکات

بەهاریش

لەسەر هەر چڵ و لەپاڵ هەر گەڵایەکدا

مۆمی داگیرساندووە

***

هەموو پلیسرکەکان گەڕانەوەو

قاوی تازەییان دا

یەکپارچە کۆڵان پڕ ئاوازە بووە

درەختی گێلاسیش

دامێنی پڕ گوڵ کردووە

***

پەنجەرەکە بکەرەوە، هاوڕێ

هیچ لەبیرتە

کە زەوی تینوویێتییەکی کوشندە سووتاندی؟

گەڵاکان ژاکان؟

تینوێتی چی بەسەر جگەری خاك هێنا؟

***

هیچ لە بیرتە؟

لە تاریکی شەوە درێژەکاندا

زللەی سەرما چی بە ڕەز کرد؟

یا بە سەرو سینەی گوڵە سپیەکان

نیوەشەو، بای تووڕە چی کرد؟

***

دە ئێستا باوەر بە موعجیزەی باران بکە و

سەخاوەت لە چاوی مێرگدا ببینە

خۆشەویستیش لە گیانی نەسیما

کە لەم کۆڵانە تەنگەبەرەدا

بەو دەستە خاڵییانەوە

ئاهەنگی رۆژی لەدایکبوونی ئەقاقییەکان

دەگێڕێ!

***

گیانی خاك بووژاوەتەوە

تۆ بۆ وەك بەردی؟

تۆ بۆئەوەندە دڵتەنگی؟

پەنجەرەکە بکەرەوە و

باوەڕ

بە بەهار بکە

*****

## کۆچ

مرۆڤ دیسان پەنا دەباتە بەر جەنگەڵ!

ئەداتە کێو!

پەنا ئەباتە بەر ئەشکەوت!

***

تۆ بەگەرمی رۆڵەکانت دەنووسێنی بەسینگتەوە

وەکوو قەرەجی ماڵ بەکۆڵ، هاوسەرەکەت

لەناو ئاگرو خوێناوا بەدوای خۆتا بەکێش دەکەی

بەردەمیشت تەقینەوەی تۆقێنەرە

دۆزەخی ترس   دەم داپچڕاو،

شارەکانیش لەناو دوکەڵ و کڵپەدا هەموو سووتاو

هێلانەکان تێکدەچن، پاک

ئارەزووەکان دەچنە ژێر خاک!

***

خەیاڵ نیە هۆ گیانەکەم!...

تەقەی فیشەک بەرز و هاوارو ناڵینیش بەردەوامە

بریقەی چەک خۆری شەرمەزارکردووە!

چۆن نابینی ئەم گشت جەورە؟

چۆن نابیستی ئەم هەموو ناڵەو هاوارە؟

دەنگی گریانی خوێناوی منداڵانی عەدەنییە،

سەلای لەرزۆکی دایکانی ڤێتنامییە،

کە لە پرسەی خۆشەویستانیاندا دەگرین

چەند رۆژێکی تریش نۆرەی من و تۆیە،

کەیا پرسە بۆ کورگەلی خۆمان بگرین!

وەیا بۆ کوشتنی کوری خەڵکی تر چمکی لێ هەڵکەین!

یاخود بۆ کێو،

بۆ دارستان

یا بۆئەشکەوت

پەنابەرین!

***

-بابە! چۆن دەچیە لای پزیشک

تۆ کە چاوت تاریک و رێگە باریکە؟

بەویستی خۆت یەک هەنگاو ناتوانی بنێی!

بە ویستی خۆت یەک بست ناتوانی بچیە پێش!

لافاوی ئاسن لە رێگەکانا جۆش ئەدا!

***

تۆ، ئەی نەنووستوو شەوو رۆژ، بە سواری ئەسپ،

-لە رۆژگاری گەنجێتیدا- لەسەر چیاو ناو دۆڵ و دەشت،

تۆ ئەی رێبواری رێگەی پر چقڵ و گابەرد،

ئێستا لە رۆخی شەقاما، بسووتێ بە چاوەروانی!

لەناو ئاگری ئەو رقەی ناو گەرووتا،

پەرینەوە تاکوو ئەوبەر، کە ناتوانی!

**کێ گوێ بە مووی سپیت دەدا؟**

**کێ هەیە بۆ یەک هەنگاویش دەستت بگرێ؟**

**منیش — کە ڕادەکەم لە دووت- خۆشحاڵم وا**

**لەم شارە بێ ڕەحمەی ئێما، چاوانی تۆ**

**ئەم مرۆڤە بێ بەزەییانە نابینن!**

***

**بابە، وەگەڕێ ماڵەوەو لەگەڵ دەردی خۆتا بژی**

**گەرچی چاوانت ئەم ژیانە نابینن**

**چ باك! کە گوێ و میلی رادیۆت کراوەیە:**

**-" هەزارو شەش سەدو یەک کەس وا ئەمرۆکە**

**بەئاگری تۆپەکان گیانیان لەدەست دا!**

**وەبەهەڵە چەند گوندێکی خۆیی لەجێی**

**ماڵی دوژمن، فرۆکە بۆردومانی کرد..!"**

***

**گەرووی وشکم قین بەتوندی دەیگوشێرێ**

**پاروو لە قورگی منداڵەکانمدا بەگیر وەستاوە**

**ئاخر ئەوان نەیاندیوە کە پیاو بگری!**

***

**گریەی ناوێ، کە کوشتاری بێباکانەی دوژمنەکان**

**لەبەر ئاشتی و پاراستنی ئازادییە!**

**هەر گوللەیەکیش کە سنگێ شەقار دەکا**

**دەسکەوتێکە: کە دنیا دەبێ بە بەهەشت!!**

***

بابە، غەمی تۆ ئازارم دەدا، بەڵام

خەمێکی گەورەی ترە من دەکرۆژێ:

وەرە با بیربکەینەوە

لە خاکێکی نەهامەت دیو،

کە دەنگی ناڵە دەچۆڕێ لە دەست قامچی

لە ماڵانی وێران کراو

لە کۆمەڵی بێدەنگکراو

لەدەشتی چۆڵی هەڵقرچاو

کە بەیەکجار گەڵاو گوڵ و زەکی سووتا!

لەو کێڵگانەی کەوا لە جێی گەنمی زەرد

بڵێسەی سوور،

بەرەو هەرچوار گۆشەی ئاسۆ کڵپە دەکا.

لەو چاوانەی کە برسی بوون،

لەو دەستانەی کە درێژبوون،

لە تەرمی منداڵێکی ناو مەرەزەدا

لەو ژیانەی کەتا ئەبەد بەسەرچووە لە جەستەیدا!

***

وەرە، هۆن هۆن بگرین لە بۆ حاڵی بەشەر

کە ناتوانێ لەگەڵ برای خۆشیا ژیان بباتە سەر

وجوودێکی ئاوا پیرۆز لەکوێ دەتوانێ هەڵ بکا؟

رەشمەیەکی ئاوا پساو بۆ کوێ دەتوانێ مل بنێ؟

گرمەی فیشەکێک وەڵامم دەداتەوە:

- ئەداتە کێو!

پەنا ئەباتە بەر ئەشکەوت!

مرۆڤ دیسان پەنا دەباتە بەر جەنگەڵ!

****

## ئەی هەمشە چاک

لە کانیی لوتفی بێرۆختا

ماسییەکم هەردەم تینوو

مەوجی چاوی میهرەبانت

ئەمبا چۆن بکا ئارەزوو

***

لەبن باڵی مەلی بزەت،

لەژێر خۆری گەرمی ماچت

ئەی کانیی پاک!ئەمن قوم قوم

دەترێژمەخوار بۆ ناو گەرووم

تاپڕکەم گیانم لەگیانت

***

ئەی هەردەم چاک!

ئەی هەمیشە ئاشنا پێم!

تا هەموو رۆخە دوورەکان،

تا هەر کوێیەک چاو بڕەکا

عەتر و و گۆرانی و پێکەنین،

لە ئامێزتا مەلە دەکا!

***

ماسییەکم هەردەم تینوو

ئەی سەرچاوەی دەرخشاوە

یەك سات ئەگەر بەجێم بێڵیٚ

ماسیت گیانی لەدەست داوە!

*****

## ئازار

نازانم و

-ئەمەش مایەی ئەشکەنجەیەکی سەختمە-

کە بۆ مرۆڤ، ئەم دانایە،

پەیامبەرە

لە هەوڵیدا:

-کە لەرادەی موعجیزەشی رەت کردووە-

کەچی پەیی بە موعجیزەی خۆشەویستی نەبردووە،

لەبەر چییە؟

***

لەبەر چییە

کە هێشتاکە

میهرەبانیی نەناسیوە؟

وە نازانیٚ لەتوێی زەردەخەنەیەکدا

چ شتگەلی سەرسوڕهێنەر شاراوەیە!

***

من لام وایە، لەم دنیایە

چاک بوون —بە خوا- لە گشت شتیٚ ئاسانترە

وە ناشزانم،

بۆچی مرۆڤ،

بەم رادەیە

لەگەڵ چاکی

بێگانەیە.

ئەمەش مایەی ئەشکەنجەیەکی سەختمە!

*****

## کەسێکی تر لە مندا

لەپشت ئەم چارشێوی زەردەخەنەیەوە
لەپشت ئەم نیگا شادەوە
روخساری بێدەنگی مرۆڤێکی ترە
پیاوێکی تر کە ساڵهای ساڵ
لەخامۆشی و تەنیایی بێ برانەوا
بێ هیوا، بێ هیوا، بێ هیوا
ژیاوە
پیاوێکی تر کە لەپشت ئەم چارشێوی زەردەخەنەوە
هەمیشە و بەهەر بۆنەوە
پڕ بەدڵ هۆن هۆن گریاوە!

پیاوێکی تر لەپشت ئەم نیگا شادەوە دانیشتووە
پیاوێکی تر کە شانە ماندووەکانی
کێوێک ئەشکەنجەی نارەوای هەڵگرتووە
پیاوێکی کەنەفت کە چاوی
بێدەنگانە چیرۆکی غەم دەگێڕنەوە

لەپشت چارشێوی خەندەوە
دەنگی قامچی دێتە بەرگوێ:
-لەسەرخۆ!

لەسەرخۆ!

لەسەرخۆ!

لەسەرخۆ!

لەدرزە سوورەکانەوەش

یەکڕێ ئەچۆڕێ خوێنی گەش

لەسەر گۆنای ئەم سیسەڵە بێ قسەیە

پیاوێکی تر لەپشت ئەم چارشێوی زەردەخەنەیەوە دانیشتووە

بە نیگای خەڵتانی فرمێسک

بە دڵێ گوشراو لە مشتا

خەنجەرێ شکاو لە سینە

خەنجەرێ چەقیو بە پشتا

خۆزگە ئەکرا ئەم نیگای بە ئەشک گیراوە

بەسەر جیهانێکی ترا پەخش بکرێ

خۆزگە دەکرا ئەم دڵە توند هەڵگوشراوە

-بێ نرختر لەهەرچی پارەیی قەڵبە-

لەژێر ئاسمانیکی تردا سەودا بکرێ

خۆزگە دەرکرا لەم ئەستێرە کوێرانەوە

بەرەو کاکێشانێکی تر فیرار بکرێ

ئەم قسەیە بەکێ بڵێم

کە وا ئازارێکی ترە، لەدەستی خود فیرارکردن

وە ئەم ژەهرە جۆراوجۆرە

وەك ئاوی پاك هەڵقوراندن

ئەی کەنارە نادیارە نەمرەکان

ئەم تێکشکاوە دان بەخۆدا گرتووە

لە کام جێگا پەنادەدەن؟

ئێوەش کەوا دڵتان داوە بە قسەی من

ئەمە مرۆڤێکی ترە

گفتوگۆتان لەگەڵ دەکا

پیاوێکی تر کە شیعری من

رەنگدانەوەی ناڵینی تاساوی ئەون

*****

## هەمیشە تۆی

شەوان کەهەر بێدەنگییەو بێدەنگی و تار

خەیاڵی تۆ بانگم ئەکا لە نادیار

خەیاڵی تۆ لە حەز ئەمهێنێتە فڕین

شەوان کەهەر بێدەنگییەو بێدەنگی و تار

شەپۆلی ئاهەنگت لەدوور ئەگاتە لام

تۆ دەریا ومن تینووی عەشقت، وەک ماسی وام

ئەم گڕەی سات بەسات لەگیان کڵپە ئەکا

لەگەرمی ئەم تاسەیەم چاک خەبەر ئەدا

ژوانی تۆ گەر رۆژی ئەزەل بێتە دەستم

بە لەززەتی چاولەڕێیی من هەر مەستم

ئەی عیشق من خاوەنی دنیام خاوەنی تۆ

هەمیشە تۆی، تۆ چی بڵێی، چیت بوێ تۆ

*****

# تۆ لێره نی تا ببینی

تۆ لێرەنی تا ببینی

کەچۆن عەترت لە قوڵایی ساتەکانا پەخش بووە!

کەچۆن وێنەت لە بریقەی شووشەکانا نەخش بووە!

چۆن جێگات لە گیانی ژینا کەسك بووە.

***

پەنجەرە هەر کراوەیە

تۆش لەبەرزی هەیوانەوە باغ سەیرەکەی

درەختەکان، چیمەن و گوڵی شەمدانی

لەو زەمزەمە شیرینەی تۆ، لەو زەردەخەنە نەرمەی تۆ

لەو نیگا پڕ لە هەتاوەت وردەبنەوە.

***

چۆلەکەکان

کەلەبەر دیارنەبوونی تۆ

رووی تۆمەتیان کردۆتە من

بەناوت بانگت لێ دەکەن

هێشتا لەسەر ترۆپکی سنەوبەرەکانەوە

تەماشای وێنەی تۆ دەکەن

لەکەناری باخچەکەدا

لەژێر درەخت

لەگوێ حەوزا

لەئاوێنەی پاکی ئاوا

***

تۆلێرەنی تا ببینی

چۆن سەدای شیعری نیگای تۆ

تێکەڵ گۆرانی من بووە!

تۆلێرەنی تا ببینی چلۆن شنەبای گیانی تۆ

لەباخی بێ چرۆی منا دێت و دەچێ

***

ئای لەو هەموو نیوەشەوەی

کە لەپەڵەهەوری سپیی لەوحی ئاسمان

وێنەی تۆم دروست کردووە

بەوجۆرەی دڵ ویستوویەتی

***

ئای لەوهەموو نیوە شەوەی-کاتێ هەوری حەزلەیاری-

هەر لەحزە هەزار دەموچاو رەسم دەکا

من بەیەک چاوتروکاندن

لەناو ئەو هەموو روخسارا

یەکسەر تۆم ناسیوەتەوە

***

ئەڵێی خەوە

کت و مت هەر ئەڵێی خەوە

چراو دیوار، ئاوێنە، گشت بێ تۆ خەمبار!

تۆ لێرە نی تا ببینی

لەگەڵ دیوار

وەکوو یەک دۆستی میهرەبان

دەربارەی تۆ قسە ئەکەم!

تۆ لێرە نی تا ببینی

چۆن لە دیوار وەڵام ئەبیەم!

***

تۆ لێرە نی تا ببینی چۆن لەدووریت

تۆزێکی قورقوشمینی خەم

باڵی بەسەر هەموو شتێکی دڵمدا راکێشاوە

تۆ لێرەنی تا ببینی دڵی تەرەم

بێجگە لە تۆ بیری لەلای هیچ نەماوە

لەزەردەپەری نامۆدا

لەم دالآنی تاسەیەدا

باڵندەکان کپ و خەمبار

ئەستێرەکان بێحاڵ، بێزار!

لەم هیوا بێهودەیەشدا

چاوانی من

دوو مۆمی گیان سووتاوی بەردەوام بێدار

تۆ لێرە نی تاببینی!

*****

## لە نەرمایی شەوا

شەو هێندە نەرم، ئەتوانی ئەستێرە بچنی

هەر ئەستێرەم بویستایە دەستم ئەگەیشتە کنی!

نەک لەسەر بان،

بەڵکوو لەبن دەوەنەکان!

لەناو ئاوێنەی یەک یەکی ئەستێرەکان تۆم ئەبینی!

لەناو دەشتی بێ پایانا

نیوە شەوان

بێجگە لەمن کە بەخەیاڵی تۆ وێڵ بووم

بێجگە لە من کەلە پەناتدا دەسووتام، غەریبانە

بەس ئەستێرە بوو دەگرِا

بەس شنەبا بوو دەگەرِا.

*****

## شکۆی ڕووان

خاك چۆن هەناسە ئەدات؟ دەی بیرکەینەوە

***

چ زەمهەریرێکی سەیر!

روخساری هەتاو شکا

بزرکا سینەی زەوی

زراوی بەرد یەکالا!

باڵندەکانی هەوا پۆل پۆل تەسلیمیان کرد گیان!

گوڵهێنەرەکانی مێرگ بۆ هەتا هەتا ژاکان

لەئاسمان و لە زەوی ترس لە کەمیندا بوو

لە بێکاتی زەمانا، مەرگ لەبەر دەگا بوو!

مەر جیهان کۆتایی هات؟

ئاسمان وەڵامی نەبوو

باغ دیسان پێ ئەکەنێ؟

هیچ کەس دڵنیا نەبوو

چ زەمهەریرێکی سەیر...

***

خاك چۆن هەناسە ئەدا؟

با فێربین:

***

ئەوا شكۆی ڕووانە:

سەرەتای مانگی نەورۆز!

ئەو هەموو بەفرە سووتا!

ئەو هەموو گوڵە پشكووت!

ئەو هەموو ڕەنگە نەخشا!

***

زەوی وا فێری كردین

لەبەردەم كارەساتا دەستەو ئەژنۆ نەكەوین

مەگەر كەمتر لە خاكین؟

زەوی هەناسەی دا بۆ ئێمە هەناسە نەدەین؟

*****

# ئێمە ، هەمان کۆمەڵی پەرش

به یادی "نیما"وه، خاوەنی هۆنراوەی " ئەی خەڵکینە"

**شەپۆل وەک کێو دەهات و دەیدا لە کەنار**

***

**لەدڵی تاری شەپۆلی دەنگ بەرزەوە**

**کە خنکاوێکی بەناخیا دەبردە خوار،**

**وە بە مشتیش بەسەر هاواریا دەیماڵی**

**نەعرەتەیەک، ماندوو و خوێنین،**

**لە مرۆڤایەتی داوای یاریی دەکرد:**

**-"ئەی خەڵکینە..**

**ئەی خەڵکینە.."**

**گوێمان لێ بوو ئێمەو نەچووینە کۆمەکی!**

**بەو خەیاڵەی قەزاو قەدەر،**

**بەڵکوو رێگەی بکەوێتە ئەو ماندووە!**

**"لە غەیبەوە دەستێ بێت و کارێ بکا!"**

**هیچ یەکێکمان لە جێگەی خۆمان نەجووڵاین!**

**قۆڵەکانمان لێ هەڵنەکرد**

**دەستمان نەدایە دەستی ئەو خنکاوەی ناو مەوجی بەلا،**

**هەتا-بەڵکوو- لەو تەهلوکە قوتاری کەین،**

**تا رەوانەی کەناری کەین!...**

***

شەپۆل دەهات و وەکو کێو دەرژایە رۆخ.

بە ناڵەیەک،

کە تێکەڵ بە کپی دەبوو.

لەگەڵ ئەو خنکاوەی کە لەو تەنگانەدا،

چنگی گیر دەکرد لە کەفی ئاو و هەوا،

ئامبازدەبوو...

***

بێئاگا بووبن،

لەوەی کەوا ئەو بەدبەختەی لە گێژەنی دەریادا وا گرفتارە،

ئەو بەدبەختەی کە بەوجۆرە چارەنووسی نادیارە،

ئەوە منم،

ئەوە ئەتۆی،

ئەوە جیرانە،

مرۆڤە!

ئەوە ئێمەین!

ئێمە،

هەمان کۆمەڵی پەرش،

هەمان تەنیا،

هەر هەمان ئەو تەنیایانەین!

***

هەموو بێدەنگ دانیشتین و تێمان روانی.

بەڵام ئەو دەنگە کپ نەبوو.

"ئەی خەڵکینە..

ئەی خەڵکینە.."

ئەو دەنگە قەت خامۆش نابێ،

لەگشت شوێنێ ئەو دەنگە لە ئاسماندایە!

هەتا هەبێ لە دنیادا، دڵێکی لەرزیو لەدەست جەور،

یا خەیاڵێ پەرێشان بێ،

یاخود چاوێ پڕ گریان بێ،

لەهەر شوێنێ دەستی ئیحتیاجی مرۆڤ دریژ بووبێ،

ئەو دەنگە هەر لە ئاسۆدا زرینگەی دێ!

***

ئاخ، ئەگەر بە دڵ و بەگیان گوێی پێ بدەین

ئاخ، گەر یەك سات وەسوەسەی نان لەبیر بکەین،

" ئەی خەڵکینە"

لە گشت شوێنێ دێتە بەرگوێ.

***

پاش ئەوەی ئەو هەموو خوێنە

ڕژایە خاك،

ئەم گیانەمان لێ شەرم بێ!

ئەم نانەمان لێ شەرم بێ!

ئێمە تەنیا دانیشتین و سەیرمان کرد!

***

لە شەوی تاری جیهانا

لە دەربەندێکی وا تاریک و تۆفانا!

لە ناخی ئەم هەموو بەزم و ئاژاوانا

ئەو کەسەی کەوا لە پەلوپۆ دەکەوێ،

ئەوەی کەوا بە سێدارە بێ نیشانە،

ئەوەی دەستەو یەخەی مەرگە،

ئەو هەزاران و هەزارانەی کە لەناوچوون،

ئەوە منم،

ئەوە ئەتۆی،

ئەوە جیرانە،

مرۆڤە!

ئەوە ئێمەین!

ئێمە،

هەمان کۆمەڵی پەرش، هەمان تەنیا،

هەر هەمان ئەو تەنیایانەین!

***

ئەم هەموو مەوجی بەڵایە،

هەست پێ دەکەین لەگشت لایە،

" ئەی خەڵکینە" گوێ بیست دەبین،

باش ئەزانین،

لەغەیبەوە دەستێ نایە

کەچی کەسمان یەك تاقە جار

نا ڵێێن با وا موداراتی زۆردارێکی نادان ناکەین

با قۆڵەکانی لێ هەڵکەین

دەست لەناو دەست، لە پانتایی ئاسۆی دەرکەین

تا زانایی و

میهرەبانی

لە ئاسمانی جیهان هەڵکەین..!

***

-"ئەی خەڵکینە...!

وا شەپۆل دێ..."

*****

## چرایەک لە ئاسۆدا

لەبەردەمما تا چاو بڕکا دەریایە

چرای ڕۆخی ئاسوودەیی پەیدایە

لەم کەنارە کە من بە بێ دەنگ کەوتووم

غەمم هێندەی دەریا، دڵم تەنیایە

وجوودم پێ بەکۆتی خوێناوی موتەعەللیقات

هاژەی شەپۆل لەگەڵم نەجوا ئەکات:

-هەر کەس دڵی دا بەدەریا قوتار بوو

هەر کەس دڵی دا بەدەریا قوتار بوو

من ئەو دڵەم نیە بیدەم بەدەریا

کۆتی خوێنین بۆم لاناچێ لە پێدا

نیمە ئومێد کە ئەم جەستە کەنەفتەم

بگەیەنمە ئەو کەنارەی نەپەیدا!

*****

* دڵ بەدەریا دان لە فارسیدا ئیدیۆمە بە مانای قیروسیا لێکردن. لیرەدا تەرجەمەم نەکردووە لەبەر ئەوەی لایەنی هونەریی هۆنراوەکە پشت وشەکانی ئەو ئیدیۆمە دەبەستێ

## سەدەف

سەدجار بیستووتە

هاواری دەریا

زۆرجار بەخشیوتە بە مێرغوزاری

پەپوولەی نیگا

نەتخوێندووە-دیارە- چیرۆکی ئێمە

لەم ناو کتێبە پەرێشانەدا:

هەردەم سەرەتا

وەک شەپۆلی نویٚ، پڕ جۆش و بەگوڕ

سروودی تاسەی بەسەرلێوەوە، مەست و ئاوازچڕ

سەرلەبەیانی بەماچی هەتاو گڕ لیٚ هەڵایسان

شەو لە کۆچی خۆر

ڕەدووی مانگ کەوتن، دیسان خەڵەتان

دیسان وەگەڕان

دامرکانەوە، هەستانەسەر پیٚ، ڕوو بەڕوو وەستان

دیسان خرۆشان!

دیسان تێکۆشان

لە کێشمەکێشی زریان و تۆفان خۆ قوتارکردن

هەزارەها جار سەر بەبەردا دان!

ئەم هەموو هەوڵە بۆ گەیشتن و بۆ ئارام گرتن

ئەو گەیشتنەی دێتە دەست پاش لە،

پەلوپۆکەوتن!

هەردەم کۆتایی،

بەشۆڕ بوونەوە بۆ ناو ناخی خود، خاوێن بوونەوە

لەو سەدەفەدا کە پێی دەڵێن "گیان"، بۆ گەوهەر گەڕان

نەکوو گەوهەرێ کە بێتە خشڵ لە بۆ زولەیخا

دڵێ وەک هەتاو گەرم و روون و پاک

کە بۆ هەمیشە بکاتە نوقمی رووناکی، دەریا

ئەگەر هێشتاکە نەگەیشتوویتە ئەم بێکەنارە

ئومێدی سبەی مەدە بەبادا!

*****

# هەمیشه لەگەڵ تۆ...

بۆ ئێرانم،ئێرانی نەمرم

**مانای ژیان بۆ من لەگەڵ تۆدا بوونە**

**نزیك یا دوور**

**تێر یا برسی**

**ئازاد، ئەسیر**

**دڵتەنگ، دڵشاد**

**ئەو ساتەی بێ تۆ ئەگوزەرێ، با هەر نەبێ!**

**مانای مەرگم**

**لە کەنارتا، لەرێگەی سەرفرازیتا**

**مانای ژینە.**

***

**مانای عەشقیش**

**لە چارە ما**

**لەگەڵ تۆدا، دایم لەگەڵ تۆدا، بوونە.**

*****

# لەبەرامبەر ڕەشاییا

لەبەرامبەر رەشاییا

وەستاوە، قیت

تاکو تەنها، تەواوی شەو

لە قسەیا رووناکییە،

ئاگرە لەسەر زمانی

لەسەر لێوی هاوارە:

مۆم.

***

گەر رێگە لە تیشکی بگرن، کڵپەکان زیاتر هەڵدەستێن

تاری هەڵدیٚ کە مۆمەکان دادەگیرسێن

قیت- وەکوو مۆم- بڵێی ئاخۆ ڕابوەستیٚ

لەبەرامبەر  رەشاییا

یەك نەفەر لەم جەماعەتە؟

*****

## بۆ گوڵە هەمیشە نامۆکان

ڕێگای ئێوە هەمیشە پانتایی جادەکانە!
هێڵی بەینی شارەکان
هەمیشە ڕێرەوتانە

ئەگەر لەسەر ڕێگادا
لەسێبەری درەختێ
لە ڕۆخی ڕوبارێکا
بەرەو سفرەیەك ڕاخەن
زەوی، ئاو، چیمەن، گوڵ، گیا
کەم تازۆر هەمان فەزان
کە بەچاوتان ئاشنان
***
ئێوە ئەو کوێرە ڕێیەی کە بە ناو سەوزاییا،
بۆ ئەوسەی دەشت ئەچێ
ئێوە ئەو دارستانەی لەدامێنی چۆم ونە
هەتا سەیرێکتان نەکرد!

ئێوە بەرەو لای گوڵە هەردەم نامۆ ونەکان،
ئێوە بۆ سەیری گوڵی "هەمیشە چاوەڕوانی"،
گوڵی "هەمیشە بێ هیوا"

هەنگاوێکتان نەناوە!

***

ئێوە گوڵی " چرای کانی"،

گوڵی " بووکی مانگ"،

گوڵی "بەهاری کێو"، تان نەدیوە

گوڵی "نیگای هەتاو" تان نەچنیوە!

***

وەک تیشکێک لە درزی تاشەبەردەوە

ناسک، لاواز

بەهاری عەتر و رەنگ

وەنەوشەی کاڵ و سپی

پشکوت و سەری دەرهێنا

تەماشای چیاو هەور و ئاسمانی کرد

تامی هەوای رۆژی کرد

سەری بۆ مانگ هەڵبڕی و

بازووانی تینووی حەزی کردەوە

دیسان بازووەکانی داخست و

ئاهێکی هەڵکێشا

سەحەر وەڵامی سڵاوی خۆری دایەوە

سەرێکی کێشا بەرەو رێگا

نەدەنگی پێی رێبوارێکی بیست

نەلەسەر ئاوریشمی زولفێک ئارامی گرت.

دانیشت و سووتا

بەهاری عەتر و رەنگ لەدەستی هەڵات و

شکا و

رژا!

***

وەکوو گوڵێکی نامۆ

هاتمە مەیدانی وجوود

لەچاوەروانییەکی نادیاردا

بەدرێژایی تەمەنم هەناسەبڕکێم بوو

هەزاران کاروان تێپەڕین

هەزاران رێبوار گەیشتن

هیچ کەس منی نەبینی

هیچ کەس منی نەچنی!

*****

## نامەویٚ بمرم

نامەویٚ من بمرم، ئەبیٚ بە کیٚ بڵێم؟

لەکویٚ ئەبیٚ هاوار بکەم؟

لەژێر کام ئاسمانەدا،

لەسەر کام کێو؟

تا تۆفانی ئەم خەمە پەی ببا بەگشت گەردی وجوود،

تا بگاتە کەشکەشانی فەلەك سەدای ئەم هاوارە!

لەکویٚ ئەبیٚ هاوار بکەم؟

فەزا کپ و ڕێی قەزا دوور

زەوی کەڕو ئاسمانیش چاوی بیٚ نوور

نامەویٚ من بمرم، ئەبیٚ بە کیٚ بڵێم؟

***

گەر ناشیرین، ئەگەر جوانە

ئەگەر بەرزە یا بیٚ مانا

من هەزار جار

ئەم دنیای فانیەم لەو دنیا باقیە خۆشتر دەویٚ.

***

گەرچی باری خەمم لەهەڵگرتن نایە

وجوودم هەرچەندە پڕ دەردو بەلآیە

نامەویٚ هەر لەم دنیایە دەست هەڵگرم!

جەستەم تەنراوی ئەوینی مرۆڤگەلی چاکی ڕەندە

بە هەزار داو دڵم بەم خەڵکە،

بەم خۆرە، بەئەم مانگە

بەم خاك و ئاوە...

پابەندە.

لە زیندووبوون مەبەستم هەر رەوتی خورد و خەوم نیە

توانای سەیری دنیای ویٚڵی ناو ژان و ئەشکەنجەم نیە

تاقەتی هاودەمیی گوڵ و کۆڕی سازو بادەم نیە.

جیهان نەخۆش و رەنجوورە

ئەو دوو رۆژەی کەدەبیٚ لای ئەم نەخۆشە بەسەر بەرم

نامەردییە ئەگەر کەمیٚ ئیٚشی گیانی هەلنەگرم

***

من نامەویٚ بمرم بەڵکوو مرۆڤ فیٚری خۆشویستن کەم

بژیم هەتا دادپەروەری هەلایسیٚنم

هەتا ئەبەد عاقڵی و میهر لەسەر عەرشی زەوی دانیٚم

لەبەرپیٚی سبەینیٚگەلی باشترا گوڵ بوەشیٚنم

کام سبەینیٚ، کەم جیهانە!

جیهانی پڕ عەشق و گوڵ و مۆسیقا و نوور...

نامەویٚ بمرم، ئەی خودا!

ئەی ئاسمان!

ئەی شەو!

من نامەویٚ

من نامەویٚ

من نامەویٚ

مەگەر زۆرە؟

*****

## خۆشەویستی بکەن

ئەی گشت خەڵکی، لەم دنیایەدا چی ئەکەن؟
عومری گر انبەهاتان چۆن بەسەر ئەبەن؟
هەرچی لەم جیهاندایە بەدەست بێنن
هیچتان نیە ئەگەر دڵتان بە عەشق نەدەن

ئێوە ئەگەر دڵ تەسلیمی ئەوین نەکەن
بەئەستێرەش ئەگەر بگەن، پولێ ناکەن
عیشق بکەن
خۆشەویستی ئەنجام بدەن!

*****

# گڕی بێدار

ئەمەوێیت و ویستوومی تا نەفەسم بوو

ئەسووتام لە حەسرەتا و عیشقت بەسم بوو

ئەوینی تۆم بەسە، ئەم گڕە بێدارە

چرای شەوی درێژی ناو قەفەسم بوو

بەختی سرکم ساتێ هات و زوو تێ پەڕی

غەم بوو کە دایم دەستی لەناو دەسم بوو

دەستی من و باوەشی تۆ، ئاخ یەک تەمەن

تەنیا یەک سات لەگەڵ تۆبوون، هەوەسم بوو

بەخوا بێجگە لەیادی تۆ کەس شک نابەم

حاشا گەر غەیری عیشقی تۆ هیچکەسم بوو

ئەی عیشق سیمای مەسیحایی خەمباری تۆ

لە غوربەتی ئەم زەحمەتا گشت کەسم بوو

باڵ سووتاو و زمان بەسراو کۆی تۆم جێ هێشت

رۆشتم، بەخوا تەنیا تاسەی تۆ بەسم بوو.

*****

# گەڵاو با

بەناو گۆرانی گەڵادا، گەڕا با
بەدەم باوە گەڵاکان هاتنە لەرزین
هەرچی گەڵای وشک بوو کەوتە زەوی
باغ ناڵی:
-"دەک با نەمێنیٚ!"

گەڵا خۆی وشک هەڵاتبوو، با بردی،
سەیرم لیٚ دیٚ، کەچی بوو تاوانی با؟
با هەرگیز دوژمنی گەڵا نەبووە
هیچ خەتای بای تیا نیە مەرگی گەڵا.

ژیان تۆزە تۆزە دەپووکێتەوە
وەکوو گەڵا وشک و ژاکاوی دەکا
لەناکاو مەرگ دێـت و دەیبا وەکوو با
دەی ژیانە یا مەرگ دوژمنی دەکا؟
***
گەڵای وشکم بەچڵی وجوودەوە
ئەبیٚ کەی بیٚ ئەو زریانە بمگاتیٚ؟
دەی تۆش هاوڕیٚ تۆزە تۆزە مەمکوژە!
تا حەزنەکەم بەم زووانە بمگاتیٚ!
*****

## دەنگێک لەسەنگەرەوە

دەستی من بگرە کەوا ئاو لەسەرم تێپەڕی
خوێنی روخسارم بشۆ، تیر لەپەرِم تێپەری
لەناو ئەم دوکەڵەدا وەک گڕ سەرم هەڵهێنا
هەتا ئەم شەوە لەبەر چاوی تەرِم تێپەڕی
تاسەی رزگاریم دەرگای زیندانی غەمی شکاند
بۆنی خۆشی بەربەیان لەسەنگەرم تێپەڕی
بەهاورێکانم بڵێن:" دوای سۆراغی وەتەن کەوت
لەهەرشوێنێ کە گەردی خۆلەمێشم تێپەڕی
لەهەر دڵۆپە خوێنم چەندین هەتاو پشکوتن
هەرجێ کە پارچەی دڵی پارەپارەم تێپەڕی
لەناو سۆمای چاومدا  نەخشا باخی پڕ لەگوڵ
کاتێ ناوی نیشتمان لەدەفتەرم تێپەڕی

*****

## یەک ئاسمان پەلەوەر

یەک ئاسمان پەلەوەر، بەرەللا و لەسەر چڵان

لە ناو باخچەی بەیانی،

یەک ئاسمان پەلەوەر

خەریکی خۆتەڕکردن،

لە ناو سەرچاوەی بادا

یەک ئاسمان پەلەوەر،

لەناو فەرشی گییادا

ئازاد و دڵشاد و مەست.

لەپشت شووشەکانەوە

ناڵینی رقێک دەڵێ:

نەمێنێ قەفەس!

*****

## تاقانەیی

بۆ سوهراب سپیهری

لەسەر ترۆپک ڕاوەستام
باوەشم کردەوە
جەستەم بە سروەی بەیان و
گیانیشم سپارد بە هەتاو
***

گیانی تاقانەیی
لەگەڵ خۆر وئاسمانا،
لەگەڵ بەرد و نەسیما،
لەگەڵ ئاوو لەگەڵ گیا،
دەگەڕێ بەناو تانوپۆی منا
***

شەپۆلێکی نەرم، چنراو لە جەوهەری جیهان،
تا قووڵایی حەوت پەردەی جەستەی هەڵدڕی
" من" ی لەجەستە رفاند و
" ئێمە" جێ ما و
لە نەمریدا خۆی دییەوە
*****

## ئێستاش بە زمانی فرمێسك...

من بە زمانی باڵندە، مانگ، شنە، ئاو
بۆ خەڵکی ئەم زەمانە زۆر وتارم هۆنیوەتەوە

لەسەر زمانی گەڵا، من
ژانی دارم
لەژێر قامچیی بێرەحمی باو بروسکەدا
خستۆتە بەرچاوی گێتی

لەسەر زمانی باران، من
ماتەمنامەی درێژم زۆر خوێندۆتەوە
تاکو بە زمانی شەبەق
دیاری ڕووناکی هیواتان بۆ بهێنم
زۆر شەوانی بێ ئەستێرە
بێدار ماوم!
***
ئەوا ئێستاش
-خوا ئەزانێ- زۆر دەمێکە لەگەڵ ئێوە
من هەر بەو زمانەی خۆتان
بەم قسانە
چوومەتە هەر لایەك باسم لە خۆشەویستی کردووە

ئاخ! کە وەلآمی شایستەم نەبیستووە

وشە وشە من وەک خۆتان قسان دەکەم

سالآنێکە لەناوتانا بەم زمانە

هاوار ئەکەم

-ئا بەمجۆرە لەناو خوێنا دە یەکتری مەگەوزێنن

ئا بەمجۆرە پەڕو باڵی

یەکتری هەڵمەوەرێنن!

ئەم گوللەیە مەرگە بۆچی ئەیوەشینن؟

نەنگە بۆچی...

ئەیتەقێنن؟

***

ئایا ئێوە

یەک سات، یەک هەناسە، یەک جار

ئەوەتی هەن تێ فکریون؟

من سوێند ئەخۆم هەموو بران لەگەڵ یەکا

سا بەنەرمی بروانن رووخساری برا!

***

لەسەر زمانی باران، من

لەسەر زمانی گەلآ، من

بە زمانی با ئەم قسانە ناکەم من

وشە وشە وەکوو خۆتان قسە ئەکەم

من ئەوەتا،

بە زمانی ئەشکک...

ئایا ئێوە لەم تکایەی من تیٚ ناگەن؟

*****

# زەردەخەنەی چاوی تۆ

تەنیا بەڵگەم کە خوا هەیەو

ئەم جیهانە

قەشەنگەو ئەم،

ژیانە پڕنرخەو شیرین:

زەردەخەنەی چاوی تۆیە!

گەرچی بەو بزە شیرینەت،

وا مەست ئەبم،

باش نابینم!

***

زەردەخەنەی چاوانی تۆ

ئاوازی هەبوونی خودا

لەچاوی مندا جاڕ ئەدا!

لەجەستەمدا گشت گیانی ژین

دەهێنێتە حاڵی فڕین!

گیانم-کە دووریت لەمنی زەوت کردووە-

دەژێتەوە

خۆش و شیرین

# گیانی سەوزایی

لەساتی کۆچی دوایی سوهراب سپیهریدا

هاورێ تۆچی ئەپرسی

– که "سوهراب" بۆ کام لا ڕۆی؟

سوهراب بوو، "سپیهری*" بوو

بۆ "سەر وەقتی خودا" رۆی!

ئەو نووری بەربەریان بوو کە لەم دەشتە کۆچی کرد

ئەو گیانی سەوزایی بوو لەگەڵ بای سەبادا ڕۆی

لەگەڵ هەتاو لە ئاسۆی تاریکی ئەم شارەدا

شەوقی بڵاوکردەوە و بەپێی حوکمی قەزا ڕۆی

وەک پەپوولەی لەششووک و ئاسانفڕ لەناکاوا

هات و

سوورێکی خواردو

گوڵی وت،

بۆ هەوا رۆی!

***

ئەی پۆشاکی هۆنراوەت، " دەزووی نەوای کەناری"

کە تۆ جێت هێشت سەوزایی و باغ، نوور و نەوا رۆی!



# وانەی مامۆستا

لەناو پۆلی رۆژگارا
وانەی جۆراوجۆر زۆر هەیە
وانەی پەیداکردنی نان
وانەی لەگەڵ ئەم و ئەو ژیان

وانەی ئەوین
هی رق و قین
وانەی بەیەك ئاشنا بوون
وانەی بەئەشکی غەمەوە لێك جودابوون

لەپەنا ئەم وانەو مامۆستایانەدا
لەپەنا ئەم نمرەی سفر و بیستانەدا
مامۆستایەکی مەزنیش
هەموو تەمەن، گشت ئان و سات،
لە لاتایە و نیشە لە لات

ناوی مامۆستا مردنە!
ئەو وانەیەی دەرسی ئەدا
وانەی ژینە!

*****

## فاڵ

ژنێ فاڵی لەبۆ گرتمەوەو دەیوت:
-ژنێ خەوو ئارامی لێ هەڵگرتووی
لە نەخشی قاوا ئەبینم دەمێکە
خەون و خەیاڵی لێ حەرام کردووی

روخساری جوان قەدو باڵای بڵندە
نیگای هەتا دڵ حەزکا ئەفسونکارە
ئەیەوێ تۆ حەیرانی بی تا ماوی
حەیرانی لەم جۆرەشی بێ شومارە

فریو مەخۆ گەرچی خۆش خەتت و خاڵە
تا پێت هێزی تیایە هەڵێ لەدەستی
دڵ مەبەستە بە زولفی ستەمکاری
پشت بە بزەی بەڵاداری نەبەستی

سەوداسەرت رائەگرێ بە هیوا
بە فرت و فێڵ دڵت نەرم رائەگرێ
ئەتسوورێنێ بەتینوێتی، بێ تاقەت
وەفا هەرگیز لای ئەو سۆراغ ناکرێ

بە فاڵچیم وت: لە ڕێم ساردناکەیتەوە

چون تەوێڵت لە نەخشی عیشق خاڵییە

ئەگەر راستیش بڵێی هێشتا هەر ئەوین

وادەفەرمویٚ و من هیچ چارەی دیم نییە

*****

## زوڵمی دۆست

مردن یەعنی:

مەل، نا

گوڵ، نا

ئەوین، نا

ئاسمان، نا

بولبول، نا

مردن یەعنی:

ون بوون لەم دنیایە، گۆڕ!

دوور

لەهەموو وجوود

دوور!

مردن یەعنی:

پیس، ناشیرین، رەشایی

مردن یەعنی:

نە خۆر ، نە مانگ

مردن یەعنی:

نەمەی ، نە یار، نە گەڵا

بە سادەیی:

مردن مردنە تەنیا!

***

**هەرچی بڵێی لە کینەی ئەم دوژمنە**

**زەفەر نابا تۆقین بەم دڵەی منە**

**مردن ئەگەریش ئەژدیهای حەوسەرە**

**لای من هێشتا لە زوڵمی دۆست باشترە!**

*****

## حەیران

گەر هەر رۆژێ تەنیا ماچێ میوانت بم

هەموو تەمەن خەریکی پیاهەڵدانت بم

گەر پەیمانت لەگەڵمدا بەریتە سەر

هەتا ماوم من گیرۆدەی پەیمانت بم

عیشقی تۆ بوو بە حاکمی وجوودی من

چی ئەفەرمووی من سەر لەرێی فەرمانت بم

گەر لەدەورت حەیران ماوم لێم ببوورە

لەبەرئەوەی خۆم حەزئەکەم حەیرانت بم

حەیرانیی چاویی تۆ مایەی رزگارییە

رێگەم بدە تا حەیرانی چاوانت بم

******

## چەند

لەبەینی گیانی دوو کەسی هێند لێک نزیک

چەندیٚ دووری؟

ئاخر چەندیٚ دووری؟ ئاه!

چەند قەتیس مان لە خەرمانەی بزەو شەرما؟

چەندیٚ دامان لە پەردەی بێدەنگی  نیگا؟

***

چەندە دووری لەهەتاوی ئەو بزەیە

چەند بێبەشی لە ساباتی پەرچەمی ئەو

چەند گوزەران بەدوور لەو ناز و  عیشوەیە

چەند؟

***

چەند..؟ چەند..؟

بۆ لێکخشانی دڵ و بەرد گویٚ شل کردن

بۆ حوکمی موبهەمی قەزا مل کەچ کردن

***

مرۆڤ چەندە بە دەوای ئەوین سووتاوە؟

مەگەر لە عومری بێبەرمان چەندیٚ ماوە؟

مەگەر چ کاریٚ خۆشترە لە خۆشویستن؟

مەگەر گوناهە خۆشویستن بۆ پیاوو ژن؟

چەند تۆڵەی ئەو گوناهەمان بدەینەوە؟

هەتا مردن چەند ئەبێ خۆ بخۆینەوە؟

چەند پیاسە بە خەیالاْ، دڵ پڕ لە داخ؟

چەند سەبرکەین، سەبر بە قورسایی یەک شاخ؟

لەژێر قەمچی حەزا چەندێ سوور هەڵگەران؟

چەند دانیشتن بەبێ تۆ کپ و نیگەران؟

***

بێ تۆ چەندە بە دوای خۆدا شوێن هەڵگرتن؟

بیابانی تاقەت لەگەڵ تۆ تەی کردن؟

***

لەبەینی گیانی دوو عاشقی هێند لێک نزیک

چەند ئەبێ دڵ پڕ تاسە بێ و سەبریش مەجبوور؟

چەندە ئەبێ نزیک بیت و هێندیش لێک دوور؟

چەند؟ چەند؟

*****

## لەو جیهانە خۆشەدا

ڕێگەم هەیە

لەپەنا ئەم حەسارەوە

بڕوانمە ڕەنگی ئەو خونچە شیرینە؟

***

لای ئەم تەلبەندە خوێنینە پڕ چقڵەوە،

-ئا ئەم تەلە دڕکینە-

تەنیا قومێ لە ئاوی کانی نۆش بکەم؟

" لەدەرەوە، لەبەر دەگا"

***

تینێکی کەم هەتاوەکوو بێتە گیانم،

لەسایەی ئەم درەختەدا، پشوویەك بەم،

ڕێگەم هەیە؟

***

یا هەر دەبێ غەریبانە، بەم ڕێگەیەدا ڕێ بکەم

ئەم حیرسی "بێتوانایی" ی چەندین سەدەیەش

وەکوو خەنجەر لە گەرووی بەئۆقرەم بدەم؟

***

لە سێبەری پانتایی ئەم خێمە شینا

چەند خۆش دەبوو گەر درەخت،ئاو، زەوی، هەتاو

تایبەت بە هیچ کەس نەبوایەن!

**راستر بڵێم**

**هی گشت خەڵکی دنیا بوایەن!**

***

**دنیای دۆستان، هی ئاشنایان**

**یەک ماڵی گەورەی جیهان و**

**خەڵکی دنیاش،**

**یەک خێزان و،**

**تانوپۆیان ئاوێتەی گیان!**

**لەگەڵ یەکا، بۆ یەکتری**

**بەدەستی فرمانکەرەوە، گشت شان بە شان!**

**ئا لەو جیهانە خۆشەدا**

**لەو دەشتە سەر سەوزانەدا،**

**کەوا ئاسۆیە پەرژینیان!**

**لەو باغە پڕ گوڵانەدا،**

**کەوا نەسیمە دیواریان!**

***

**لەگەڵ هەموو زەکێکا قوڵپی رۆشنایی و شادیی ئەوین !**

**گەرمی ناز و نەوای میهرە لەناو هەموو سترانێکا**

**روون وەک چرا زەردەخەنەی باخەوانان**

**نەعرەی شادی جوتیارەکان**

**بەرز تا ئاسمان**

***

**ئێمە وا خەریکی ئیشین**

**بە سینەی پڕ لەشەوقی ژین**

**بە ڕووی وەك باخی نەستەرەن، شاد و شیرین**

**بە چاوی پڕ لە خۆشویستن!**

***

**ئێمە ئەوین ئەوەشێنین**

**وەك تۆو بەسەر رووی زەمینا**

**ئێمە هۆنراوە ئەخوێنین**

**وەکوو خونچەگەلی درەخت!**

**وەکوو هەمووان،**

**پڕ سروودین،**

**رزگار لە کۆت،**

**ئازاد، خۆشبەخت..!**

*****

## شەوان کە... ئەسووتا

**شەوان کە دەریا**

**سەری ئەکێشا**

**بە بەردی رۆخا**

**وەکوو پرسەدار**

**شەوان کە ئەیخوێند**

ئەو مەلە پەستە

تەنیاتر لە مانگ

لەسەر چڵی دار

شەوان کە ئەڕژا

خوێنی گولاڵە

لە خەنجەری با

بەسەر سەوزەزار

لە غوربەتی دەشت

شەوان کە هەبوو

بۆ بۆنی سەحەر

چاومان چاوەنوار

شەوان کە خەمناك

رێگەمان دەبڕی

لەژێر بارانا

بەدڵی سوێدار

هەرگیز لە ئێمە

خەمگینتر، نەیدی

چاوی ئەستێرە

لە هیچ رۆژگار

ئەی سوبحی رووناك

چاوو دڵی من

بۆ رووی جوانی تۆ

وەك ئاوێنەیە

وەگەڕێ کەوا

وەك بزەی بەیان

ئاسۆی گشت پڕ کرد

دەنگی شۆڕەسوار

*****

# تینوو لە ئاوا

بۆ هاورێی مەزنی لەدەستچووم " مەحمودی
تەفەززولی" کە ساڵی ١٣٥٥ لە میونیخەوە
نوسیبووی " لێرە هەموو شتێک پاک و
نوورانیە بەڵام من وەک وێڵێک وام کە مەگەر
تەنیا لە نیشتمانەکەم ئارام بگرم"

لەگەڵ چەند چڵە نێرگس و،
ماسی و سووراحیی بلوورو
مۆم و چراو ئاوێنەدا
نەورۆز دەبەمەوە بۆ ماڵی خامۆشم

هەرچەندەکە ،
پەلکەزێرینەکەی بزە
لەبەردەگای ماڵان نیە
هەرچەندە لە بەرەبەیانی بەهارا
لەشاردا یەک ستران نیە.

مۆم و چراو ئاوێنە و گوڵ
ئارەزوون، شاد
یاخود وەکوو " حافز" دەڵێ
"دەستەی موراد"

بەلاَم لەناو ئەم حەسارە بلوورینا

ماسییەکی هەراسان زیندان کراوە!

هەرچەندە ئاو

روونە وەکوو فرمێسکی چاو

هەرچەندە کە بلوور پڕە

لە ئاوازی ئاوێنەو

لە فڕینی نوور!

لە دەستەی مۆم، چراو ئاوێنەو نێرگسا

ئەم ماسییە هەراسانە،

بە نیگای پڕ پەرێشانی

سووراحی تەنگ دەور ئەداو دەور ئەدا

بۆ دیتنی دەلاقەیەک

بەلاَم نابینیٚ رێگەیەک

بۆ ئازادی!

من لە نیگای ماسی لە سووراحیی تەنگا

بێتاقەت و قارس ئەبم

لەشەرمی ئەم ستەمەی بەم ماسییە رەوا دەبینریٚ

وەختە لە پێش چاویا ببمە قەترەیەک ئاو!

هەروەکوو با، بە خێرایی

دەرئەپەڕم

دیلەکەی ناو شوورەی بلوور

ئەبەم بۆ لای حەوزی ماڵە خامۆشەکەم

بەئەسپاییتر لەگەڵا

ئەیبەخشم بە ئاو!

تێی دەروانم، لە چالاکیی ئازادییا

لەو فەزا کراوەیەدا

وا هەڵدەفرێ!

ئازاد و تیژباڵ، گورج و گۆڵ،

سەرمەست بەسەر زەوی و کاتا ناز ئەفرۆشێ!

گەرچی دیواری حەوزەکەم قەوزە گرتوو

پاشۆرەکان خراپ، شکاو

ئاوی مەنگیش لەم رۆژگارە تاڵانەدا

سەوزهەڵگەڕاو

گەرچی بلوور نیە حەوز

گەرچی رۆشن وەکوو ئەشکی چاو نیە ئاو

بەڵام جیهانی ئەو نیشتمانی ئەوە

لێرە هەرچی لەناویدا شەپۆل ئەدا

پەیوەستە بە زەڕە زەڕەی وجوودیەوە

ئاه، ئەی تراویلکە دووره

چۆن دەتوانی گومڕام بکەی،

بەو ڕووناکی وبەو بلووره؟

*****

## بە هەموو فرمێسکەکانمەوە

رۆژنامەکان نووسیبوویان لەئەنجامی
بۆردومانی قوتابخانەیەکدا لە لوبنان
چەند سەد منداڵێک گیانیان لەدەست دا.
.."و بۆ هەر شوێنێک کە جەنگی لێیە!"

شەرم بتانگرێ ئەی خواوەندانی زۆر،
وازبهێنن!
واز بێنن لەم هەموو زوڵم و زۆردارییە
وازبهێنن!
پاسەوانانی ئازادی!
ئەی پارێزەرانی ئاشتی!
ئەی بە لوتفی ئێوە، جیهان لە قووڵایی دۆزەخ کەوتوو،
بەسەر دڵی خەڵکیدا قورقوشمی داغ دەبارێنن!
قورقوشمی داغ!
شەپۆلی خوێن دەدەن لە رووی ئەو کەشتییەی خۆپەرستی
شەپۆلی خوێن!

ئەگەر کوێر نیت، ئەگەر کەڕ نیت،
گەر شەستیرەکانتان یەک سات بێدەنگ دەبن،
گوێ بگرن و تەماشاکەن:
گوێبگرن لەم شینی دایکی دڵ سووتاوە،

لەم شەوە سامناکەدا پرسەی داناوە!

گوێ بگرن لەم ناڵەناڵی منداڵە داک مردووانە،

کە لە دەست ستەمی ئێوە لەهەرلاوە دێتە بەرگوێ!

تەماشاکەن ئەم کێڵگانە کە بەکرێگیراوەکانتان،

شەوو رۆژ بە خوێنی خەڵکی ئاویان دەدەن!

تەماشاکەن خەڵکی جیهان چۆن وا دان بەخۆدا گرتوو،

بەرگەی زوڵمی ئێوە دەگرن!

ئەی چاوبەردان! دەستی خەڵکی لەدەست ئێوە بەرەو خوایە!

هەرچەندە ئەشزانم کەوا

ئەوەی بێدارنابێتەوە،

ویژدانی ئێوەیەو خەوی مەرگی بێگوناهەکانە!

بەڵام هەر بەهەموو فرمێسکەکانمەوە-نائومێدانە- تکا دەکەم:

وازبهێنن!

وازبهێنن!

بیر لەدایکانی چاوەروان بکەنەوە!

بەزەییتان بەم خونچە تازە نازدارانەدا بێتەوە!

دەوازبێنن!

*****

# رەگ لە خاکا

لەوەلامی هاورێیەکی ئازادیخواز و ئێرانپەروەردا
کە ساڵی ١٣٥٢ ئەم وڵاتەی بەجێ هێشت و هانی
منیشی ئەدا بۆ کۆچ کردن

ڕۆژێ تۆ هەر ئەم دەشتە وشک و تینووە بە جێ دێڵی و
خوا حافیزیی فرمێسکی من دەتخاتە رێ
نیگات خەمگین و بێزارە
دڵ بە چقڵی نائومێدی بریندارە
جەستەت خەمی بێ سەروبەریی ئەم ناوە
هێزو تینی لەدەست داوە
***
تۆ خۆت بە خوێن و ئارەقە
ڕەنگ و بوومی ئەم دارستانە ژاکاوەت بووژاندەوە
لەگەڵ ئەم هەموو زریانە بێ ئەمانە
دەستی خاڵی چوویتە مەیدان
بەجێ هێشتنی ئەم خاکە بەلای تۆوە
دەست بەرداربوونت لە گیانە
لەگەڵ دانە دانە گەڵای سەوزەڵانا
پەیوەندی دڵت پەنهانە
***
ئەم هەورە تاریکی بەخشە بێ بەزەیی و بێ بارانە
ساڵ لەدوای ساڵ وشکە ساڵان

پشت کردنی هاوڕێیانی  نیوەی ڕێگاو

درۆ و دەلەسەی غەمخواران

هێزی ئەژنۆی تۆیان پسان

مەیدانی شوومی  چەقەڵان

قیرەی پەی دەرپەی قەلەرەش

رق و قینی تۆیان هەستان

***

تۆ ئا بەو تەوێلە پاك و نەجیبەوە

كە لەو پەڕی پەڵە گەنمەكانەوە

جوانتر لە سەد تاجی هەتاو .. چ شكۆدارانە هەڵ دێ!

تۆ بەو گۆنا سووتاوانەی بەر خۆرەتاوی دەشتەوە

تۆ بەو سەرو سیما داگیرساوەی گڕی غیرەتەوە

كە چاوی من بەرزتر لە سەد جامی جەمشید ئەیبینێ

بەچاوانی خەمبارتەوە كە رۆژگارێ كانی پر لە شادی بوون و

ئێستاش سایەی داغ و حەسرەت

باڵی بەسەردا كێشاون

لێرە دەڕۆی!

خواحافیزی  فرمێسكی من دەتخاتە رێ

لێرە ئەمن ڕەگم لە دڵی  خاكایە

لێرە ئەمن ئەگەر ئالوودە یا پاكم- عاشقی ئەم سەرزەمینەم

گەرچی ناشزانم من لێرە بەتەمای چیم

بۆ خۆم لێرە ئەمێنمەوە هەتا دوا گوڕی  هەناسەم

**ئەگەرچی هیوای رووناکیش لەم تاریکیا شك  نابەم**

**بەڵام ئەمن هەر لێرەدا، لەم دەشتە تینوو و وشکەدا**

**بەسەر دەبەم**

**لەدڵی ئەم زەمینەدا بە دەستی بەتاڵەوە گوڵ ئەوەشێنم**

**سەرەنجام رۆژێ من لێرە وەکوو هەتاو**

**لە ئاسۆی کێوەکانەوە**

**سروودی سەرکەوتن دەڵێم**

**دڵنیام تۆش رۆژێ لەرۆژان دێیتەوە**

*****

**وەرگێڕ لەچەند دێڕێکدا:**



- ناصح قەرەداخی (ئارام قەرەداغی) لەدایك بووی ١٩٦١، قەرەداخی سلێمانی
- دەرچووی کۆلێژی پزیشکی و پسپۆری پەتاناسی
- لەسەرەتای هەشتاکانەوە بە نووسین و وەرگێڕانی چیرۆکی بیانی و بابەتی زانستی لە گۆڤارەکانی ئەو سەردەمەدا دەستی پێ کردووە.
- لەساڵی ١٩٨٦ سەربازیی بەجێ هێشتووە و وەك پزیشك پەیوەندی کردووە بە هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە
- لەپاش ڕاپەرین لە کۆماری ئیسلامی ماوەتەوەو کاری کردووە. ساڵی ١٩٩٦ گەڕاوەتەوە کوردستان و ماوەی پێنج ساڵ بەرپرسی ڕاگەیاندنی یونیسێف بووە لە کوردستان.
- ئێستا مامۆستایە لە زانکۆی سلێمانی
- بەرهەمە چاپکراوەکانی:

١. سیستەمی کارپێکردنی دۆس، سلێمانی ١٩٩٧، ١٩٩٨

٢. زمانگیری: تیۆری و چارەسەر، چاپەمەنی زاموا، ١٩٩٨ (وەرگێڕان لە فارسییەوە)

٣. هەژاران، دۆستۆیێڤسکی، چاپەمەنیی زاموا، ١٩٩٨(وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە)

٤. ئافرەتێکی تەنیا: ژیان و هەڵبژاردەی هۆنراوەکانی فروغی فەرروخزاد، هەولێر، ٢٠٠١ (وەرگێڕان لە فارسییەوە)

٥. سوپەرسروشت: لێکدانەوەی سروشتیی دیاردە سوپەرسروشتییەکان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٢ (وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە)

٦. Kurdish Phrase-Book: An Easy Way to Learn Essentials of Kurdish Language, Khak Press and Media Center, 2001,2003

